


# سەردەمی گوڵین
# ٣

## حەزرەتی عومەر
## ڕەزای خوای لێبێت

نووسینی: زەکەریا ئولاشلی
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: مایس - ٢٠١٤
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٤٢٦)ی
ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە
تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# ناوەرۆك



# منداڵێک لەدایک دەبێت

قەدپاڵەکانی کێوی "عەقر" شوێنێک بوو کە خانووە قوڕەکان تێیدا یەک لەدووی یەک ڕیزیان بەستبوو. لە بەشی پشتەوەی خانووەکان، تاک و تەرا دەوەنی کورتەبنە بەرچاو دەکەوتن. لە یەکێک لەم خانوانەدا

"خەتتاب" دەژیا. خەتتاب خاوەن کەسایەتییەکی زۆر جددی و ڕەق بوو؛ لە ژیانیدا کەس نەیدیبوو پێبکەنێت. لەو ڕۆژانەی دواییدا ئەوەندە ڕووی گرژ بوو کەس نەیدەوێرا قسەی لەگەڵدا بکات.

خێزانی "خەتتاب" چاوەڕوانی لەدایکبوونی منداڵێك بوون. بەڵام ئەوەی نیگەرانی کردبوون، ئەگەری لەدایکبوونی منداڵێکی کچ بوو. لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگەی عەرەبیی ئەو سەردەمەدا کچ بە شووم دەبینرا. ئەو خێزانەی کچیان دەبوو، یان دەبوو بەرگەی ئەو هەموو تانە و تەشەر و سووکایەتییە بگرن کە ڕووبەڕووی دەبوونەوە، یاخود دەچوون و بەدەستی خۆیان کچە نازدارەکەیان زیندەبەچاڵ دەکرد.

خەتتاب ئەو ڕۆژە بەیانی زوو ئاژەڵەکانی لە گەوڕەکە هێنایە دەر و تا ئێوارە لە دەشت و دەر لەوەڕاندنی. بەڵام خەیاڵی هەر لای منداڵە چاوەڕوانکراوەکەی بوو.

دەمەو ئێوارە ئاژەڵەکانی گرد کردەوە و لە تووڵەڕێیەکەوە گەڕایەوە.

کاتێك گەیشتەوە ماڵەوە، خۆر لەپشت شاخەکانەوە ون ببوو. خەتتاب ئاژەڵەکانی خستەوە ناو گەوڕەکە و ئالیکی بۆ ڕۆکردن. ئینجا بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوت. چاك ماندوو ببوو، دەیویست چی زووترە بگاتەوە ماڵەوە. بەهەنگاوی خێرا کۆڵانە تەسکەکانی تێپەڕاند. کاتێك گەیشتە کۆڵانی خۆیان، قەرەباڵغییەکی لەبەردەم ماڵی خۆیاندا بینی. یەکسەر ترسی لێ نیشت. دەبێت هۆکاری ئەم قەرەباڵغییە چی بێت؟ خوانەخواستە تۆ بڵێی شتێکی خراپ ڕووی نەدابێت؟ خەتتاب بەم ئەندێشە و خەیاڵانەوە لە شوێنی خۆی چەقی.

منداڵێکی دوانزەساڵان کە خەتتابی بینی، بە ڕاکردن بەرەو لای هات.

- مزگێنیم بدەرێ!

دڵی خەتتاب بەم داوایە کەمێك هێور بووەوە. قۆڵی منداڵەکەی گرت و لێی پرسی:

- بڵێ بزانم، مزگێنی چیت پێیە؟

- ئەگەر ئەوەی دەمەوێت، نەمدەیتێ، پێت ناڵێم؟

کاتێك خەتتاب تێگەیشت ئەم منداڵە هیچی پێ ناڵێت، وتی:

- بڵێ با بزانم چیت ئەوێت؟

منداڵەکە بە خۆشحاڵییەوە وتی:

- پێڵاو، پێڵاوێکی زۆوۆر تازە و نوێ.

- بەڵێن بێت یەك جووت پێڵاوی نفت و نوێت بۆ دەکڕم.

منداڵەکە وتی:

- دەی باشە.

ئینجا مزگێنییەکەی پێدا و وتی:

-کوڕتان بووە!

- چیی؟! کوڕمان بووە؟

- بەڵێ، چاو و دڵت ڕوون. کەمێك پێش ئێستا کوڕێکی جوانتان بوو.

خەتتاب بە بیستنی ئەم هەواڵە خۆشە، هۆشی لای خۆی نەما.

دەستی خستە بنباڵی منداڵەکە و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و پێی وت:

- نەك جووتێك، کورە دە جووتت بۆ دەکڕم.

منداڵەکە بە خەیاڵی جووتە پێڵاوەکەیەوە لەو ناوە دوورکەوتەوە. خەتتابیش بە دڵشادی ڕووەو ماڵی خۆیان بەڕێ کەوت. هەر ئەوەندی گەیشتە ماڵەوە، پڕ بەقوڕگی خۆی هاواری کرد:

- با ئاهەنگ و شادی دەست پێبکات!

خەتتاب یەکەمجاری بوو ئاوا دڵخۆش بێت. لە خۆشیاندا هەر ئەمسەر و ئەوسەری بوو. ئەوەندە دڵشاد بوو وای هەست دەکرد بارێکی قورس لە سەر شانی لاچووە.

ئەم ئاهەنگانە چەندین ڕۆژ درێژەی کێشا. وە ماڵی خەتتاب لەو کەسانەی کە بۆ پیرۆزبایی هاتبوون جمەی دەهات.

ئەوە ئیتر ئەویش بووە خاوەنی کوڕێك. کوڕێکی شێر ئاسا. خۆ چەندین مانگ بوو هەر بەم خەیاڵەوە دەژیا.

منداڵەکەیان ناونا عومەر. عومەر بێ ئاگا بوو لەم بەسەرهاتانەی دەوروبەری. بۆخۆی لەنێو لانکەکەیدا نووستبوو.

* * *



# عومەر گەورە دەبێت

سەردەم سەردەمێکی وا بوو نە کوڕ نرخی بۆ باوکی دادەنا، نە باوکیش خۆی دەکردە خاوەنی کوڕ. درۆ و تەڵەکەبازی گەیشتبووە لوتکە. لە مەککەدا کەس متمانەی بە کەس نەدەکرد، هەر کەسەو چاڵی بۆ ئەوی تر هەڵدەکەند. لەناو کۆمەڵگەدا ئافرەت و منداڵ هیچ نرخ و بەهایەکیان نەبوو.

خەڵکی سەریان لێ تێکچووبوو، نەیاندەزانی چۆن و بەچی باوەڕ بکەن. ئەو بتانەیان دەپەرست کە بەدەستی خۆیان دروستیان کردبوو.

بەزمەکەش ئەوەبوو، کە لە کاتی برسێتیدا هەڵدەستان هەر ئەو بتانەی خۆیان لە ئارد و چەندین شتی تر دروستیان کردبوون، دەیانخواردن. هاوشێوەی ئەمە نە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بینرابوو نە بیسترابووش.

عومەر هەندێک جار لەگەڵ باوکیدا دەچوو بۆ پەرستنی بتەکان. دەیبینی کە باوکی چەندین سەعات سەرقاڵی دوعاکردن بوو لە بەرامبەر بتەکاندا.

عومەر لەگەڵ گەورە بوونیدا بەرپرسیاریەتییەکانی سەرشانیشی زیادی کرد. لە تەمەنێکی زۆر بچووکەوە کەوتە یارمەتی دانی باوکی. کە بە کاری شوانییەوە سەرقاڵ بوو. وای لێهات کە ئیتر هەر خۆی بەتەنیا ئاژەڵەکانی دەلەوەڕاند. ئەو سەردەمەی ئەوی تێدا بوو سەردەمێك بوو کە نرخ و بەهای هۆزان لە هەموو سەردەمەکانی تر زیاتر بوو. بەدەم لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانەوە هۆزانی دەخوێندەوە. سەرەڕای ئەمەش لە تەمەنێکی زۆر کەمەوە دەستی دایە زۆرانبازی. هەرکاتیک عومەر پشتی هاوڕێکانی دەدا بە زەویدا، زۆر دڵشاد و ئاسوودە دەبوو، وە متمانەی بە خۆی زیادی دەکرد.

بەیانیەکی گەرمی هاوین بوو. عومەری بچووك بەو تیشکی هەتاوەی لە پەنجەرەکەیەوە هاتبووە نێو ژوورەکەی، لەجێگەکەی ڕاست بووەوە. بۆ هێوربوونەوەی دەروونی لەپای ناڕەحەتییەکانی شەوی ڕابردوو، ڕووەو پەنجەرەکە هەنگاوی نا. بۆ ماوەیەك تەماشای

خەڵکی پیادەی نێو کۆڵانەکەی کرد. دواتر چووە مەتبەخ بینی وا دایکی سەرقاڵی ئامادەکردنی نانی بەیانی بوو. سەیرێکی عومەری کرد و وتی:

- دەبینم زوو هەستاوی.

- چی بکەم دایە گیان، خەوم لێنەکەوت.

- بۆچی، ڕۆڵە گیان؟

- چوزانم... لەوە دەچێ بەبۆنەی دڵەڕاوکێوە بێت.

- من متمانەم بە کوڕی خۆم هەیە. ئەمڕۆ پشتی هەموویان دەدەیت لە زەوی.

- ئەوەندە ئاواتەخوازی ئەوەم، کە...

- ئەگەر تۆ کوڕی خەتتاب بیت سەرکەوتوو دەبیت. دەی ئێستا خۆت ئامادە بکە با درەنگ نەکەویت! تۆزێکی تر هاوڕێکانت دەگەن.

کاتێك عومەر بۆ لەبەر کردنی پۆشاکی زۆران، بەرەو ژوورەکەی خۆی ڕۆیشت، دایکیشی بەردەوام بوو لە ئامادەکردنی نانی بەیانی. لەبەر ئەوەی باوکی بەیانی زوو چووبوو بۆ لەوەڕگە، کەس لە ماڵەوە نەبوو. عومەر بە پۆشاکی زۆرانەکەیەوە گەڕایەوە. دایکی سەیرێکی سەرتاپای عومەری کرد و وتی:

- ماشەڵڵات لێبێت، دەڵێی شێری.

وتە جوانەکانی دایکی، عومەری زۆر دڵخۆش کرد. پێکەوە لەسەر

خوانی بەیانی دانیشتن. کاتێك سەرقاڵی خواردنی نانی بەیانی بوون، هاوڕێکانیشی یەکە یەکە هاتن. کاتێك هەموو ئامادە بوون، بەرەو گۆڕەپانی زۆرانبازیەکە کەوتنە ڕێ.

هەموو خەڵکی مەککە لە گۆڕەپانەکە بوون. سەرەتا منداڵان، پاشانیش گەورەکان زۆرانیان دەگرت. بە هەمان شێوەی هاوڕێکانی، ناوی عومەریش خوێندرایەوە. کاتیك چووە ناو مەیدانەکەوە لەتاو دڵەڕاوکێ ئارامی لێ بڕابوو.

زۆرانبازییەکە بە جۆش و خرۆشەوە دەستی پێکرد. ئەوەی بهاتایەتە بەردەمی عومەری بچووك، دەبەزی. مەیدانەکە بە دەنگی چەپڵە ڕێزان دەلەرییەوە. عومەر زۆر خۆشحاڵ بوو...

ڕۆژێك دوای زۆرانبازییەکە عومەر بە نازناوی قارەمانێتییەکەی خۆیەوە بە کۆڵانەکاندا دەسووڕایەوە، لەناکاو خالیدی کوڕی مامی هاتە بەردەمی و پێی وت:

- بیستوومە کەس نەماوە لە گۆڕەپانەکە نەیبەزێنیت.

- ڕاستە.

خالید:

- ئەگەر قبووڵی بکەیت، دەمەوێت زۆرانێك بگرین.

- بۆچی نەهاتی بۆ گۆڕەپانەکە؟

- باوکم نەیهێشت.

- باشە مادام وایە. با سبەی نیوەڕۆ لە تەختاییەکە یەکتر

ببینین.

بۆ رۆژی دواتر عومەر و خالید لە شوێنی دیاریکراو یەکیان بینی. هەموو شتێك بۆ دەستپێکردنی زۆرانەکە ئامادەبوو. ئاماژە درا و زۆران دەستی پێکرد. سەرەتا زۆرانبازەکان هێزی یەکترییان دەکێشا، لەدواییدا ململانێیەکی هاوسەنگ لەنێوانیاندا دەستی پێکرد. ڕکابەرەکەی زۆرانبازێکی لێهاتوو بوو. ئەو عومەرەی کە لە هەموو زۆرانبازەکانی تری بردبووەوە، وا لە بەرامبەر خالیددا زۆر زەحمەتی دەکێشا. عومەر جارێك کەوتە سەر زەوی. بە هەردوو دەستی لاقی گرتبوو. هاوڕێکانی بەرەو لای عومەر ڕایان کرد، دەرکەوت کە لاقی شکاوە.

بەم شێوەیە بێ ئەوەی هیچ کام لەو دوو زۆرانبازە لەوی تر بەرێتەوە، زۆرانەکە کۆتایی هات. عومەر زۆر دڵتەنگ بوو بەوەی نەیتوانی لە خالیدی کوڕی وەلید بباتەوە. تەنانەت بۆ ماوەیەکی دوور و درێژیش ئەمەی بیر نەچووەوە.

* * *



# مژدەی چاوەڕوانکراو

ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەدەم بانگەوازی پێغەمبەری ئازیزمانەوە دەچوون، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیادبووندا بوو. بەڵام خۆ بێباوەڕانیش هەروا بە دەست بەتاڵی دانەدەنیشتن، بۆ هەڵگێڕانەوەی موسوڵمانەکان لە ئایینی خۆیان، ئازار و ئەشکەنجەی زۆریان دەدان.

عومەری کوڕی خەتتابیش سوکایەتی بە موسوڵمانەکان دەکرد و ئەوەشی وەڵامی بدایەتەوە، لێی دەدا.

یەکێك لەوانەی کە لەم لێدانانە بەشی خۆی وەرگرت، دراوسێیەکی بوو. کاتێك عومەر بیستی دراوسێکەی موسوڵمان بووە، بەرچاوی تاریك بوو، چوو دەستێکی باشی کوتا.

ئەو ڕۆژەش هاوشێوەی ڕۆژانی پێشوو گەرمایەکی بەتین کۆڵانەکانی مەککەی تەنیبوو. کۆمەڵێك پیاو بۆ بەرگرتن لە زیادبوونی موسوڵمانان لە ماڵێکدا کۆببوونەوە و عومەریش لەناویاندا بوو. هەموو گەورەپیاوانی مەککە لە کۆبوونەوەکەدا بەشدار بوون. یەکە یەکە قسەی خۆیان دەکرد. یەکێك دەیوت با بەردەوام بین لە ئەشکەنجەدانیان، یەکێکی تر دەیوت کە پێویستە مسوڵمانەکان لە شار وەدەربنرێن.

هیشام دوا دەرفەتی قسەکردنی وەرگرت. سەرەتا یەك دوو جار تفی قوتدا و دواتر وتی:

- هاوڕێیان بەڕای من ئەم ئیشە تەنها یەك ڕێگەچارەی هەیە؛ ئەویش کوشتنی موحەممەدە.

غەڵبە غەڵبێك لە ژوورەکەدا پەیدابوو. هەرکەسەو دەنگێکی لێدەهات. یەکێکیان وتی:

- چۆن شتی وا دەبێت هیشام، کێ ئەوەندە بوێرە ڕووبەڕووی خزمەکانی موحەممەد ببێتەوە؟ ئەمە سووك و ئاسان واژۆکردنی فەرمانی مردنە.

هیشام:

- دەزانم. هەر بۆیە ئەوەی محمد بکوژێت لەلایەن منەوە سەد حوشتر وەردەگرێت.

هەموان بەدوای کەسێکدا دەگەڕان کە ئەوەندە بوێر بێت، کاری وا بکات. کەسیان نەیانوێرا بڵێت "من ئەو کارە دەکەم".

یەکێکی ناویان بە هیشامی وت:

- ئەی ناکرێت خۆت بەم کارە هەڵسیت و زەرەری سەد حوشتر لە خۆت نەدەیت.

هیشام نقەی لێوە نەهات. کەسێکی تەمەن سی و پێنج ساڵان گەیشتە فریای و وتی:

- گەر کەسێك هەبێت بتوانێت ئەم کارە بکات، ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە.

هەموان پێکەوە ڕوویان بەرەو عومەر وەرگێڕا و بەدڵەڕاوکێوە چاوەڕوانی وەڵامی عومەر بوون. عومەریش هەر یەکسەر وتی:

- دەیکوژم ، بەس پێم بڵێن ئێستا لەکوێیە، بەسە.

ئەوانەی لەوێ بوون هەناسەیەکی قوڵیان هەڵمژی و ئارامبوونەوە. یەکێکیان وتی:

- لە ماڵی ئەرقەم دەیدۆزیتەوە.

عومەر شمشێرەکەی بەست و چووە دەرەوە. دەچوو بۆ کوشتنی پێغەمبەری سەرداری بوونەوەران ﷺ.

که بەڕێگەدا دەڕۆیشت نوعەیمی خزمی هاتە پێشی و لێی پرسی:

- چی بووە، ئەوە بۆ کوێ دەچی؟

عومەر بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

- بۆ لەناوبردنی موحەممەد.

نوعەیم خەریک بوو دڵی بوەستێت. چونکە خۆی مسوڵمان ببوو، بەڵام شاردبوویەوە. بۆیە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە پرسی:

- بە ڕاستیتە... عومەر؟

عومەر بەم پرسیارە زۆر تووڕەبوو و وتی:

- مەبەستت چییە بەڕاستیتە؟ حاڵم لەوە دەچێت گاڵتە بکەم؟

نوعەیم سەری لێشێوابوو، بیری دەکردەوە ئاخۆ چی بکات. بە ئومێدی پەشیمانکردنەوەی عومەر لەم کارە وتی:

- جا لەو بڕوایەدایت کوڕەکانی عەبدولمەناف بە ساغ و سەلامەتی وازت لێبهێنن؟

ئینجا وتی:

- تۆ جارێ بچۆ بەلای ئەندامانی خانەوادەکەی خۆتەوە.

عومەر تۆزێك بیری کردەوە و پرسی:

- مەبەستت کام ئەندامی خانەوادەکەمە؟

- باسی سەعیدی زاوات و فاتیمەی خوشکت دەکەم. سوێند بێت

هەردوکیان مسوڵمان بوون.

عومەر بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر توورە بوو. بۆیە خێرا ڕێگەکەی گۆڕی و ڕووەو ماڵی زاواکەی بەڕێکەوت. کە گەیشتە لای دەرگا گوێی لە دەنگێك بوو. وادیار بوو لە ژوورەوە قورئانی پیرۆز دەخوێندرایەوە.

هێندە بەتوندی لە دەرگای دا، خەریك بوو دەرگاکە بشکێنێت. فاتیمە یەکسەر تێگەیشت ئەوە کاکەیەتی. ئەوە بوو خەبابی هاوەڵی پێغەمبەری خوا هاتبوو بۆلایان تا فێری قورئانی پیرۆزیان بکات، لەو کاتەشدا خەریکی خوێندنەوەی سورەتی "طـه" بوو. سەعید و فاتیمە هەر کە گوێیان لە دەنگی دەرگا بوو، خەبابیان شاردەوە. لاپەڕەکانی قورئانیشیان لە جێیەکدا شاردەوە.

فاتیمە بە ترس و لەرزەوە دەرگاکەی کردەوە. عومەر بە خێرایی هاتە ژورەوە، لە زاواکەی نزیك بووەوە و بە دەنگێکی زبر پرسی:

- وادیارە لەسەر ئایینی خۆتان نەماون؟

زاواکەی تێگەیشت عومەر گوێی لەوە بووە کە ئەمان دەیانخوێندەوە، بۆیە وتی:

- لەوە دەچێت ئەو دینەی ئێمە هەڵمانبژاردووە لە دینەکەی ئێوە باشتر بێت.

عومەر هەر کە ئەم قسەیەی بەرگوێ کەوت، کەوتە سەر و گوێلاکی زاواکەی. خوشکەکەی کە ئەمەی بینی، کەوتە نێوانیان و هەوڵیدا لێکیان جیابکاتەوە، بەڵام عومەر ئەمجارەیان زللەیەکی

لە خوشکەکەشی دا و لە زەویدا خستی. سەری فاتیمە بریندار بوو خوێنی لێ دەهات.

فاتیمە هەستایەوە و وتی:

- کاکە، ڕاست و حەق ئەو بتانە نین کە تۆ دەیانپەرستی، بەڵکو ئەو دینەیە کە حەزرەتی محمد ﷺ لای خواوە هێناویەتی.

عومەر بە بینینی سەری خوێناوی خوشکەکەی پەشیمان بووەوە. ئا لەم کاتەدا ئەو وتە ناوازانەی بیر کەوتەوە کە تۆزێك پێشتر بەرگوێی کەوتبوو. بۆیە بە فاتیمەی وت:

- ئەو شتەم بدەرێ کە دەتانخوێندەوە.

- بۆچیتە؟

- دەمەوێت بزانم محمد چ پەیامێکی بۆ هێناون.

- بەتەمای بیدڕێنی، وا نییە؟

عومەر بەم قسەیە ناڕەحەت بوو:

- ئەگەر مەبەستم دڕاندنی بێت، بێ ئەملا و ئەولا دەیڵێم. مەترسە، دەیخوێنمەوە و دەتاندەمەوە.

فاتیمە لاپەڕەکانی قورئانی هێنا و دایە دەست کاکەی. ئەویش دەستی کرد بە خوێندنەوەی. ئەو بەشەی کە دەیخوێندەوە، ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی "طه" بوو. لەنێو ئەمانەشدا ئایەتی "لە ئاسمانەکان و زەویدا هەرچی بوونی هەیە هەمووی موڵکی الله یە" عومەری خستە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە. عومەر کەسێك بوو کە زۆر شارەزای ئەدەب

و زمانەوانی بوو. بەڵام ئەو شتانەی کە خوێندیەوە لە هیچکام لەو شتانە نەدەچوو کە تا ئێستا بەرگوێی کەوتبوون. دوای ئەمەش هەر کە ئایەتی "ئیمان و بڕوا بە خوا و پێغەمبەرەکەی بهێنن"ی خوێندەوە، لە ناخیدا هەستی بە گۆڕانێك کرد. پەڕەکەی دەستی بۆ خوشکەکەی درێژ کرد، دڵی نەرم بوو و چاوەکانی پڕ بوون.

ئینجا وتی:

- وتەیەکی چەندە شیرین و جوانە.

بەدوای ئەمەشدا وتی: "لا اله الا الله، محمد رسول الله"و موسوڵمان بوو.

فاتیمە هەرگیز لە تەمەنیدا هێندە خۆشحاڵ نەبووبوو. لەسەرێکەوە دڵخۆشبوو، لە سەرێکیشەوە دەگریا.

عومەر دەیویست هەرچی زووترە خۆی بگەیەنێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ. بۆیە بە زاواکەی وت:

- باسی محمد و ئایینەکەیم بۆ بکە.

لەم بەینەشدا خەباب خۆی ئاشکرا کرد و هاتە دەرەوە. پاشان دەستی کرد بە باس کردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام. لەگەڵ قسەکانی خەبابدا، عومەر هێواش هێواش لە هۆش خۆی دەچوو. ئەو قسەیەی پێشتر بە زاواکەی وتبوو، دووبارەی کردەوە و وتی:

- بمبە بۆلای موحەممەد.

خەباب وتی:

- مژدەت لێبێت عومەر، ئێستا ڕێگەی ڕاستت دۆزیەوە. ئەوە نزاکەی پێغەمبەرمان گیرابوو. لەبەر ئەوەی هەمیشە بۆ موسوڵمان بوونی تۆ دوعای دەکرد.

عومەر کە گوێی لەم وشانە بوو زیاتر دڵی جۆشی سەند و وتی:

- با هەر ئێستا بڕۆین.

پێکەوە لەگەڵ خەباب بەڕێ کەوتن. زۆر تێنەپەڕی لە دەرگای ماڵی ئەرقەمیان دا.

یەکێك لە هاوەڵەکان چوو بۆ دەرگا کردنەوە، کە عومەری بینی، ترسی لێ نیشت و گەڕایەوە ژوورەوە. وتی:

- عومەر شمشێری بەستووە و ئاوا هاتووە.

حەزرەتی حەمزە کە لەوێ بوو، فەرمووی:

- لێی گەڕێن با بێت. گەر نیەتی باش بێت، ئەوا بەخێر بێت، گەر نیەتیشی خراپ بێت هەر بە شمشێرەکەی خۆی سەری دەپەڕێنم.

بۆیە فەرموویان لە عومەر کرد بێتە ژوورەوە. پێغەمبەرمان هەستایە سەرپێ و لە حەوشە پێشوازیی لێ کرد. ئینجا لێی پرسی:

- ئەی کوڕی خەتتاب ئەوە چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟ هەتا بەڵایەکت بەسەردا نەیەت، باوەڕ ناهێنی؟

عومەر جۆشی سەندبوو. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی:

-من شاهێدی دەدەم کە جگە لە "الله" هیچ خودایەکی تر نییە. شاهێدیش دەدەم کە تۆ بەندە و پێغەمبەری ئەویت.

پێغەمبەری ئازیز زۆر بەمە دڵشاد بوو. بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد "الله اکبر". هاوەڵەکانیش بەشداری ئەم شادیەیان کرد. لەناکاو ئەو حەوشەیە بە دەنگی بەرزی " الله اکبر" لەرییەوە.

* * *



# تەوافی کەعبە

موسوڵمان بوونی حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێبێت)، پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی زۆر دڵشاد کرد. لەبەر ئەوەی حەزرەتی عومەر یەکێك بوو لە بەهێزترین و بوێرترین و ئازاترین پیاوانی مەککە. ئەوانەی لەوێ بوون، یەکە یەکە دەهاتن پیرۆزباییان لە

حەزرەتی عومەر کرد. دوای تەواوبوونی پیرۆزباییەکان، حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەری ئازیزمانی پرسی:

- پێغەمبەری خوا، چەند کەس دەبین؟

کە پێغەمبەری ئازیزمان وتی چل کەسیان تێپەڕاندووە، حەزرەتی عومەر بە جۆش و خرۆشەوە وتی:

- ئێ مادام وایە، ئەی بۆچی ئیمانەکەمان دەشارینەوە؟ با بچین بۆ کەعبە و پەرستشی خۆمان لەوێ ئەنجامبدەین.

ئەم داوایەی حەزرەتی عومەر قبوڵ کرا. هەرکەس لەوێ بوو هەستایە سەرپێ و هەموو پێکەوە بەرەو کەعبە بەڕێکەوتن. بە شێوازی دوو ڕیز دەستیان کرد بە ڕێکردن. حەزرەتی حەمزە سەردەستەی ڕیزی یەکەم و حەزرەتی عومەریش سەردەستەی ڕیزی دووەم بوون. هەرکەس لە کۆڵانەکاندا دەیبینین، بە ڕاست و چەپدا ڕای دەکرد. موسوڵمانەکان ئەوەندە بەتوندی دەستیان لەیەکتر گیرکردبوو، کەس نەیدەوێرا ڕووبەڕوویان ببێتەوە.

بە هەنگاوە قورسەکانیان ڕێگەکەیان کرد بە تەپوتۆز و بەو شێوەیە ڕۆیشتن تا گەیشتنە کەعبەی پیرۆز.

کاتێك بێباوەڕان بینیان وا موسوڵمانەکان بە کۆمەڵ لە کەعبە نزیك دەبنەوە، ترس و دڵەڕاوکێ دایگرتن. نەیانتوانی لە نهێنیی ئەم هاتنەیان بگەن. لەبەر ئەوەی تا ئەو ڕۆژە، موسوڵمانەکان ناچار نەبوونایە، لە ماڵەکانیان نەدەهاتنە دەرەوە. کە حەزرەتی عومەریشیان لەنێویاندا بینی، ئەقڵیان ڕاوەستا.

ئەبوجەهل لە جێگەکەی خۆی دەرپەڕی و پرسی:

- ئەمە چییە عومەر؟ ئەوانە کێن لە پشتتەوە، ئەوە تۆ لەگەڵ کێدا هاتوویت؟

حەزرەتی عومەر وەکو شێرێك وەڵامی دایەوە:

- بە "لا اله الا الله، محمد رسول الله"وە هاتووم. ئەوە ئیتر منیش موسوڵمانم.

وەك بڵێی حەزرەتی عومەر بەم قسەیەی نەك تەنها ئەبوجەهل، بەڵکو تەحەددای هەموو خەڵکی مەککەی دەکرد.

ئەبوجەهل بەرامبەر ئەو شتانەی هاتنە بەر گوێی، ئەبڵەق بوو. دواتر حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هاواری بەسەر ئەوانەدا کرد کە لەوێ بوون:

- کەس لەشوێنی خۆی نەجوڵێت.

بێباوەڕان بێ ئەوەی هیچ کاردانەوەیەکیان هەبێت، هەرکەسەو بەلایەکدا بڵاوەیان لێکرد.

پێغەمبەری خوا لەگەڵ گشت موسوڵمانان توانیان پێکەوە بەوپەڕی ئارامی تەوافی کەعبە بکەن و، بە پێش چاوی هەموانەوە نوێژیان کرد و لە خوای گەورە پاڕانەوە.

لەدوای ئەم ڕووداوەوە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ نازناوی "فاروق" واتە "جیاکەرەوە"ی بە حەزرەتی عومەر بەخشی. ئەمەش لەبەر ئەوەی حەزرەتی عومەر لەوێدا "حەق" و "باطیل" واتە "ڕاست" و "هەڵە"ی لێك جودا کردبووەوە.

بێباوەڕان نەیانتوانی ئەم دەرکەوتنە بوێرانەیەی موسوڵمانان قبووڵ بکەن. بۆیە هەموو مامەڵەیەکیان لەگەڵ مسوڵمانەکاندا پچڕاند. نە شتیان پێدەفرۆشتن و نە شتیشیان لێدەکڕین. بەم شێوەیە جۆرە گەمارۆیەکی مرۆییان بەسەر موسوڵمانەکاندا سەپاند.

* * *



# کۆچ

لە زۆر لادێ و شار دەنگوباسی ئیسلام بیسترابوو. زۆر کەس و تیرە و هۆزیش موسوڵمان ببوون.

بە زیاد بوونی ژمارەی موسوڵمانان ڕق و ئەشکەنجەی بێباوەڕانیش هێندەی تر زیادی دەکرد. ڕۆژانێکی سەخت بەسەر موسوڵماناندا تێدەپەڕی.

ئەو مەدینەییانەی کە لە عەقەبە چاویان بە پێغەمبەری خوا کەوت، بانگهێشتی هاوەڵانیان کرد تا بچن بۆ مەدینە.

ئەشکەنجە و ئازاردانی بێباوەڕان زۆر زیادی کردبوو. ئەو موسوڵمانانەیان بەند دەکرد کە بێهێز بوون و توانای خۆپاراستنیان نەبوو، دەهاتن چەندین ڕۆژ بێ نان و ئاو لەسەر ئەو لمە گەرمە سوورەوەبووە دەیانهێشتنەوە. ئەوەندەیان لە موسوڵمانە نوێژخوێنەکان دەدا، تا دەبوورانەوە. لەو سەردەمەدا کە ئازار و ئەشکەنجەی سەر موسوڵمانان تا ئەوپەڕی سنووری خۆی تاوی سەندبوو، لەلایەن خواوە مۆڵەتی کۆچکردن بۆ پێغەمبەرمان ﷺ هات. ئەم مۆڵەتەش سەرەتای کۆچی پڕخەمی موسوڵمانان بوو. ئەو موسوڵمانانەی مۆڵەتی کۆچیان وەرگرت، هەموو ماڵ و موڵك و سامانێکیان لە مەککە بەجێهێشت و لە پێناو خوادا دەستە دەستە بەرەو مەدینە کۆچیان کرد. لە کاتی کۆچکردنیشدا هەوڵیان دەدا بێباوەڕان نەیانبینن، هەر بۆیەش زۆرتر شەوڕەوییان دەکرد.

بەڵام حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك وادەی کۆچکردنی هات، شمشێرەکەی هەڵگرت و لەماڵ چووە دەر، چوو تەوافێکی کەعبەی کرد. لەو کاتەشدا دەوڵەمەند و دەسترۆیشتووەکانی مەککە لەوێ بوون. دوو ڕکات نوێژی کرد و دواتر بەرەو لای ئەوان ئاوڕی دایەوە و وتی:

- ئەوە من سبەینێ دەچم بۆ مەدینە. ئەوەی دەیەوێت منداڵەکەی هەتیو بخات، ئەوەی دەیەوێت خێزانەکەی بێوەژن بکەوێت، ئەوەی دەیەوێت دایکی شین و واوەیلای بۆ بکات، با بەیانی بێت بۆ دۆڵی

عەقیق.

کەس نەبوو وەڵامی ئەم بانگەشەیەی حەزرەتی عومەر بداتەوە.

حەزرەتی عومەر بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر بەرەو دۆڵی عەقیق بەڕێکەوت. کاتێك گەیشتە دۆڵەکە بینی کە تەنانەت تاکە کەسێکیش نەهاتووە.

پاش کۆچێکی چەند ڕۆژە بەناو بیابانی گەرم و سووتێنەردا، حەزرەتی عومەر گەیشتە مەدینە. خەڵکی مەدینە زۆر بەجوانی پێشوازییان لێکرد. وەك چۆن مامەڵەیان لەگەڵ موسوڵمانەکانی تردا کردبوو، هەر بەوجۆرە لە ماڵی خۆیاندا میوانداریی حەزرەتی عومەریشیان کرد. خواردن و خواردنەوەکانیان لەگەڵی بەشکرد.

موسوڵمانان دەیانتوانی لێرەدا بە کامی دڵی خۆیان پەرستشەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن. ئەم بارودۆخە حەزرەتی عومەری زۆر بێتاقەت و دڵگران کرد. چونکە لە کاتێکدا ئەمان بە ئارامی دەیانتوانی نوێژەکانیان ئەنجام بدەن، مەگەر خوا خۆی بزانێت پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لە مەککە چ جۆرە ناڕەحەتیەکی دەچەشت. دەستەکانی کردەوە و بە دوور و درێژی پاڕایەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچی زووترە بێت بۆ مەدینە.

وەڵامی نزاکەی حەزرەتی عومەر دوا نەکەوت. هەواڵی ئەوەیان پێگەیشت کەوا پێغەمبەری سەروەر ﷺ لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکردا (ڕەزای خوای لێبێت) ڕێگە مەدینەیان گرتووەتە بەر. خەڵکی مەدینە بۆ پێشوازیکردن لە پێغەمبەری خۆشەویست بەکۆمەڵ هاتنە دەروازەی شار. ئیتر لێرەدا حەسرەت تەواو دەبوو. هەموان بە جۆش

و خرۆشەوە چاوەڕوانی تەشریفی موبارەکی میوانە خۆشەویستەکەیان بوون. بە یەکترببینینەوەی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی، دەتوت مەدینە جەژنە. یەکێك دەفی لێدەدا و یەکێکی تریش سروودی دەوت.

بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە، کەشێکی زۆر جیاواز باڵی بەسەر شاردا کێشا. گشت موسوڵمانان نوقمی شادی بوون.

ئەو کۆچبەرانەی لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە ماڵ و خاکی خۆیان جێهێشتبوو، هیچ شتێکیان لەگەڵ خۆیان نەهێنابوو. جا بۆ ئەوەی موهاجیرەکان (کۆچبەرەکان؛ خەڵکی مەککە) لەگەڵ بارودۆخی مەدینەدا ڕابێن و لەگەڵ ئەنصارەکان (پشتیوانەکان؛ خەڵکی مەدینە) تێکەڵ ببن، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوەیەکی ڕێکخست. لە کۆتایی ئەم کۆبوونەوەیەدا برایەتیی نێوان موهاجیرەکان و ئەنصارەکانی ڕاگەیاند. خەڵکی مەدینە لە ماڵەکانی خۆیاندا میوانداریی برا کۆچبەرەکانیان دەکەن و هاوبەشی ناخۆشی و خەمەکانیان دەبن، لە ڕووی ماددی و مەعنەویەوە پاڵپشتیان دەبن.

حەزرەتی عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) بوو بە برای عوتبانی کوڕی مالیك. عوتبان ماڵەکەی خۆی دایە حەزرەتی عومەر. حەزرەتی عومەریش لەبەرامبەر ئەم خۆبەخشییەدا نەیتوانی فرمێسکەکانی ڕابگرێت. زۆر سوپاسی عوتبانی کرد.

موسوڵمانەکانی تری مەدینەش هاوشێوەی عوتبان، هەموو جۆرە یارمەتیەکیان پێشکەش بە برا موسوڵمانەکانیان دەکرد. خۆراکیان، ماڵیان، هەموو شتێکیان لەگەڵدا بەش دەکردن. موهاجیرەکان زۆر بەمە خۆشحاڵ بوون. لە لایەکەوە لەدەست ئەشکەنجەی هاوەڵدانەران

دەربازیان ببوو، لە لایەکی تریشەوە دۆستانێکیان وەدەست هێنابوو کە بەهەموو جۆرێک یارمەتییان دەدان.

کۆچبەرەکان، لەگەڵ پشتیوانەکان لە کێڵگە و باخچە خورماکاندا کاریان دەکرد. هەندێکی تریشیان لە بازاڕدا کڕین و فرۆشییان دەکرد.

عوتبان و حەزرەتی عومەریش (ڕەزای خوایان لێبێت) لەوانە بوون کە پێکەوە کاریان دەکرد. بەڵام ئەمە کێشەیەکی بۆ دروست کردبوون. گەر هەردوکیان پێکەوە کاریان بکردایە، ئەوا لە وتەکانی پێغەمبەری خوا بێبەش دەبوون. دەبوو چارەسەرێك بۆ ئەم کێشەیە بدۆزنەوە. عوتبان وتی:

- ئەی عومەر، ڕۆژێك تۆ کار بکە، ڕۆژێکیش من. ئەوەی لەماڵەوە دەمێنێتەوە بەشداری دانیشتنەکانی پێغەمبەری خوا بکات، ئینجا لەوێدا هەرچییەکی بیست دوایی بۆ ئەوی ترمانی بگێڕێتەوە. بەم شێوەیە لە باس و بابەتەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بێبەش نابین.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەم پێشنیارەی زۆر بەلاوە پەسەند بوو. باوەشی بە عوتباندا کرد و وتی:

- چەندە جوان بیرت لێی کردووەتەوە .خوا لێت ڕازی بێت.

لەو ڕۆژە بەدواوە بە نۆرە دەچوونە سەر کار.





# زرێی گۆڕاو

ساڵی سێیەمی هیجری بوو. ساڵێك بەسەر جەنگی بەدردا تێپەڕیبوو. ڕێگەی بازرگانی شام لەلایەن موسوڵمانانەوە کۆنترۆڵ کرابوو، وە ڕێگەی بازرگانیی لە بێباوەڕان گیرابوو. بێباوەڕانیش دەیانویست تۆڵەی جەنگی بەدر لە موسوڵمانان بکەنەوە. بۆ ئەم

مەبەستەش سوپایەکی سێ هەزار کەسییان ئامادە کرد و بەرەو کێوی ئوحود بەڕێ کەوتن.

مسوڵمانانیش کە ئەم هەواڵەیان پێگەشت، خۆیان ئامادەکرد و بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان بەڕێکەوتن.

پێش ئەوەی جەنگ دەست پێبکات، حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) زەیدی برا گەورەیی بردە کەنارێك. زرێکەی بەری خۆی داکەند و بۆی درێژکرد و وتی:

- ئەم زرێیە بگرە.

کاکەی لە مەبەستەکەی تێنەگەیشت. بۆیە سەیرێکی زرێکەی کرد و پرسی:

- چی لێ بکەم؟

حەزرەتی عومەر بۆئەوەی براکەی بپارێزێت وتی:

- ئەم زرێیە لە زرێکەی تۆ باشترە، دەمەوێت ئەمە لەبەر بکەیت.

دوای ئەمە زەید پرسی:

- ئەی خۆت؟

- منیش ئەوەی تۆ لەبەر دەکەم.

لە چاوانی حەزرەتی زەیددا (ڕەزای خوای لێبێت) دوو دڵۆپ فرمێسك درەوشانەوە. حەزرەتی عومەر گیانی براکەیی دەدا بەسەر گیانی خۆیدا. زەید زرێکەی لەبەر کرد و پرسی:

- ئێستا دڵت ئارامی گرت برام؟

حەزرەتی عومەر بە خەندەوە وتی:

- بەڵێ.

براکەی وتی:

- خوا لێت ڕازی بێت.

ئینجا دووبارە زرێکەی داکەندەوە و دایەوە.

- ئەم زرێیە بۆ خۆت پێویستترە.

حەزرەتی عومەر هەرچەندە تکای کرد و هەوڵی دا، بەڵام نەیتوانی براکەی ڕازی بکات زرێکەی لێوەربگرێت. بەم شێوەیە حەرزەتی زەید و حەزرەتی عومەر بەرەو مەیدانی جەنگ بەڕێکەوتن.

جەنگ لەوپەڕی سەختیدا بوو. موسوڵمانان کە بە ئومێد و خەیاڵی شەهیدبوونەوە دەجەنگان، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بێباوەڕانیان توشی شکست کرد.

کاتێك وا دەرکەوت کە موسوڵمانان سەرکەوتوون، ئەو تیر هاوێژانەش کە پێغەمبەری خوا پێی وتبوون: "تەنانەت ئەگەر لە حاڵێکدا جەنگیش تەواوبێت، هەتا من پێتان نەڵێم، جێگەکانتان بەجێ مەهێڵن." هاتنە خوارەوە بۆ ناو مەیدانی جەنگەکە. سەربازەکانی دوژمنیش هەر بەدوای هەلێکی وادا دەگەڕان، بۆیە یەکسەر بەدەوری کێوەکەدا سووڕانەوە و لە دواوە هێرشیان کرد. بەم شێوەیە موسوڵمانان کەوتنە نێوان دوو بەرداشی جەنگەوە.

ئەو سەرکەوتنەی خەریك بوو وەدەست کەوێت، گۆڕا بە دۆڕان. لەم ساتانەشدا دەنگۆی مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بڵاوبووەوە.

هەندێ لە هاوەڵان کە گوێیان لەم هەواڵە بوو، دەیانوت:

- ئەگەر پێغەمبەری خوا مردبێت، ئەم کارە لێرەدا تەواو ئەبێت.

ئا لەم کاتەدا حەزرەتی عومەر و زەید هاواریان کرد:

- مادام پێغەمبەری سەروەر وەفاتی کردوە، ئەوا ئێمەش تا شکانی شمشێرەکانمان دەجەنگین و شەهید دەبین.

بەم شێوەیە دیسان هێرشیان بردەوە. دواتر ئەوانەی کە بینیان پێغەمبەری خوا زیندووە و نەمردووە لە دەوری کۆبوونەوە.

جەنگ بەجۆرێك کۆتایی هات کە بە خواستی موسوڵمانان نەبوو، هاوەڵانیش خۆیان دایە پاڵ کێوی ئوحود.

ئەبوسوفیان لێیان نزیك بویەوەو هاواری کرد:

- موحەممەد لە ناوتاندایە؟ ئەی ئەبوبەکر لە ناوتاندایە؟

وەڵام نەبوو، بۆیە بە بێباوەڕانی وت:"هەموویان مردوون." بەڵام حەزرەتی عومەر ﷺ ڕوویەرووی بووەوە و وەڵامی دایەوە:

- هەموومان سەلامەتین و نەمردووین.

ئەبوسوفیان، لەپای ئەم وەڵامە ڕووی کردەوە بەلای بێباوەڕاندا و وتی:

- با دیسان هێرش بکەینەوە.

سەفحانی کوڕی ئومەییە بەرپەرچی قسەکەی دایەوە و وتی:

- با بگەڕێینەوە. چونکە هەتا ئەوانەی دەورویەری نەکوژین

ناتوانین بگەینە محمد. با ئەم سەرکەوتنەمان نەگۆڕین بە شکست.

دوژمنەکان گەڕانەوە بۆ مەککە. موسوڵمانانیش جارێکی تر شوێنیان کەوتنەوە و ترسیان خستە دڵی بێباوەڕانەوە.

* * *



# ڕێککەوتن

لە ساڵی شەشی کۆچیدا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا بە مەبەستی تەوافی کەعبە و عومرە ڕێگەی مەککەیان گرتە بەر. کاتێك نزیکی مەککە بوونەوە، نوێنەرێکیان بۆ لای بێباوەڕان نارد. نوێنەرەکەش بە بێباوەڕانی ڕاگەیاند کە ئەوان بۆ شەڕ نەهاتوون بۆ حودەیبیە.

پێغەمبەر ﷺ ویستی بۆ ئەم مەبەستە حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بنێرێت بۆ مەککە، بەڵام حەزرەتی عومەر وتی کە لە مەککەدا دوژمنی هەیە، بۆیە پێشنیاری کرد حەزرەتی عوسمان

بنێرن. ئەم پێشنیارەش قبوولکرا و حەزرەتی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) نێردرا بۆ مەککە.

بێباوەڕان زۆر لە حەزرەتی عوسمان تووڕە بوون، بۆیە دەستبەسەریان کرد. ئەم ڕووداوەش وا گەیشتەوە بە موسوڵمانان کە حەزرەتی عوسمان کوژراوە. پێغەمبەری خوا ﷺ بەم هەواڵە تا بڵێی نیگەران بوو. بەرامبەر بەم هەڵسوکەوتەی قورەیشییەکان جگە لە جەنگ چارەیەکی تر نەدەمایەوە. بۆیە پێغەمبەری سەروەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو:

- خوای گەورەو باڵادەست ، فەرمانی داوە بەیعەتتان لێوەرگرم.

لەپاش ئەمە، نزیکەی هەزار و چوارسەد هاوەڵ، بەیعەتیان دا کە بەدرێژای تەمەنیان لای پێغەمبەری خوا بن.

بەڵام پێغەمبەری خاوەن شەفەقەت دانی بەخۆیدا گرت و بڕیاردرا لەبری جەنگ لەگەڵ قوڕەیشدا چاوپێکەوتن بکرێت. پاشان ئەو چاوپێکەوتنانەش بە ڕێککەوتن کۆتاییان هات. بە پێی ئەم ڕێککەوتنە، هەردوولا بەدرێژایی دە ساڵ جەنگیان دژی یەك بەرپا نەدەکرد، موسوڵمانەکانیش دەگەڕانەوە و بۆ ساڵی دواتر دەهاتنەوە بۆ عومرە، هەروەها ئەگەر کەسێك لە مەککەوە بۆ مەدینە هەڵبێت دەگەڕێنریتەوە، بەڵام ئەگەر لە مەدینەوە بێت و خۆی بداتە پاڵ مەککەییەکان، ئەوا ناگەڕەێنرێتەوە.

مەرجەکان زۆر قورس بوون. ئەم بارودۆخەش موسوڵمانانی زۆر دڵتەنگ کرد. پێغەمبەری خواش ﷺ ئەم ڕێککەوتنەی بۆ ئایندەی ئیسلام زۆر بە گرنگ دەبینی. چونکە ئەم ڕێککەوتنە ئەوەی

دەگەیاند کە پێباوەڕانی مەککە دانیان بە بوونی دەوڵەتی ئیسلامدا دەنا. لە دوای ئەم ڕێککەوتنەوە هەرکەس کوێی پێ خۆشبێت، دەتوانێت بۆی بڕوات. بەم شێوەیەش جوانییەکانی مسوڵمانان و ئیسلام بۆ هەموان ئاشکرا دەبوو. بەڵام ئەو هاوەڵانەی بۆ تەوافی کەعبە هاتبوون نارەزاییان دەربڕی. یەکێك لەوانەی نارەزاییان دەربڕی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بوو، ئەوەبوو لە پێغەمبەری خوای پرسی:

- تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟

- بەڵێ، من پێغەمبەری خوام.

- ئەی دینی ئێمە حەق و ئەوەی ئەوانیش باتڵ نییە؟

- با، وایە.

- دەی کەواتە بۆچی ڕێگە دەدەی سەروەری بۆ ئەوان بێت؟

- من پەروەردگارم چۆن فەرمانی پێکردووم، ئەوە دەکەم.

حەزرەتی عومەر کە نەیدەتوانی ئەم گەڕانەوەیە لەناخیدا هەرس بکات و بیشارێتەوە، بەردەوام بوو لە پرسیار کردن:

- ئەی نەتوت تەوافی کەعبە دەکەین؟

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بێ ئەوەی لە پرسیارەکان بێزار بێت، وەڵامی دەدایەوە و فەرمووی:

- بەڵێ، وام وت.

حەزرەتی عومەر هەر ئەوەندەی ئەوێی بەجێهێشت، یەکسەر

ترسێك کەوتە ناخیەوە. داخۆ تۆ بڵێی لە بەرامبەر پێغەمبەری خوادا زیادەڕۆیی کردبێت؟ بەم ترسەوە ماوەیەك لەو ناوەدا هات و چوو. سەرەنجام دەنگێکی بیست کە وەك ئەوە وابوو ئاوی کوڵاو بکرێت بە سەرتاپای گیانیدا:

- لە کوێی عومەر؟ پێغەمبەری خوا بانگت دەکات.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لەبەر خۆیەوە دەیوت: ”ماڵ وێرانبی عومەر، نەتدەتوانی ئەو زمانەت ڕاگری.“ بەدەم ئەم قسانەوە گەیشتە خزمەتی پێغەمبەر.

کاتیك ڕووخساری دەم بە خەندەی پێغەمبەری خوای بینی، بۆ کەمێکیش بێت دڵی هێور بووەوە.

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ، سورەتی فەتحی خوێندەوە کە تازە بۆی دابەزیبوو و مژدەی ئەوەی پێدەدان کە ئەم ڕێککەوتنەی لە ڕواڵەتدا وەك دۆڕان دەبینرا، لە ڕاستیدا سەرکەوتنی مسوڵمانانە.

* * *



# جێنشینی هەڵبژێردراو

پێغەمبەری نازیزمان ﷺ لە ساڵی دەی کۆچیدا بۆ جیهانی ئەبەدی کۆچی دوایی کرد. لەپاش ئەویش حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) وەك جێنشین هەڵبژێردرا. حەزرەتی عومەر

لە سەردەمی ئەودا وەك یاریدەدەری حەزرەتی ئەبوبەکر کاری دەکرد. لە سەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکردا (ڕەزای خوای لێبێت) موسوڵمانان تا ناوجەرگەی دەوڵەتی بیزەنتی و فارس چوون و ئیسلامیان بە خەڵکێکی زۆر ناساند. حەزرەتی ئەبوبەکر کە کەسێك بوو ئەوپەڕی دادپەروەر بوو، دوای دوو ساڵ و دوو مانگ لە جێنیشینی کۆچی دوایی کرد.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) پێش وەفاتی نەخۆش کەوت، پاش نەخۆش کەوتنیشی پێشنویژیی بۆ حەزرەتی عومەر بەجێهێشت. بەم هەڵوێستەی ئەوەی پیشانددا کە پێشنیازی ئەوە دەکات لە دوای خۆی حەزرەتی عومەر بکرێتە جێنشین. هەر بۆ ئەم مەبەستەش یەکە یەکەی هاوەڵە پێشەنگەکانی بانگ کرد و ئەم بابەتەی لەگەڵدا باسکردن. لەپێشدا بابەتەکەی لای عەبدوررەحمانی کوڕی عەوف کردەوە کە یەکێک بوو لە مژدەپێدراوانی بەهەشت و لێی پرسی:

- ڕات چۆنە دەربارەی عومەر؟ پێتباشە ئەو ببێت بە جێنشین؟

عەبدوررەحمانی کوڕی عەوف وەڵامی دایەوە و وتی:

- تۆ عومەر لە من باشتر دەناسیت.

حەزرەتی ئەبوبەکر وتی:

- تەنانەت گەر بیرکردنەوەی تۆ بەم شێوەیەش بێت، دەبێت ئێستا بۆچوونی خۆت بڵێیت.

عەبدوررەحمانی کوڕی عەوف بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

-عومەر شایستەی ئەم بەرپرسیارێتییەیە، بەڵام زوو تووڕە دەبێت.

حەزرەتی ئەبوبەکر، بەنۆرە بۆچوونی حەزرەتی عوسمان، ئوسەیدی کوڕی حوزیر و هاوەڵەکانی دیکەی وەرگرت. هەموو لەسەر هەمان قسە کۆك بوون: "لەپاش تۆ کەس نییە لە عومەر باشتر بێت. ئەو گونجاوترین کەسە بۆ جێنیشینی."

لە پاش ئەمانە حەزرەتی ئەبوبەکر بە حەزرەتی عوسمانی وت کاغەز و قەڵەم بهێنێت. حەزرەتی ئەبوبەکر کاغەز و قەڵەمەکەی گرتە دەست و نووسی: "عومەری کوڕی خەتتاب، لە جێگەی خۆم وەك جێنیشین پێشنیار دەکەم. گوێڕایەڵی ئەو بکەن. بەم شێوەیەش، کارێکی باش و چاکم لەبەر خوا و پێغەمبەرەکەی کردووە."

ئەم بۆچوونەی خستە بەردەم ڕاوبۆچوونی موسوڵمانان:

- عومەرم لەجێی خۆم هەڵبژاردووە، لێی ڕازین؟ قبووڵی دەکەن؟

ئەو موسوڵمانانەی لەوێ بوون بەیەك دەنگ هاواریان کرد:

- قبووڵی دەکەین و ڕازین.

لە ناو قەرەباڵغیەکەوە دەنگێکی گڕ بەرزبووەوە. دەنگی حەزرەتی عەلی بوو.

- بەجۆرێك ڕازین کە ئەگەر جگە لە عومەر کەسێکی تر بووایە قبوڵمان نەدەکرد.

بەم شێوەیە حەزرەتی عومەر وەك جێنشین هەڵبژێردرا.

* * *



# خزمەتکار

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت)، خێراییەکی بەرچاوی بە هەڵمەتی فتوحات بەخشی. دەیویست هەرچی زووترە ناوی خوا بدات بە گوێی هەموو دونیادا. بەهێزترین دەوڵەتە فەرمانڕەواکانی ئەو سەردەمە، ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی و فارسی ساسانی بوون. لەشکرەکەی عەمری کوڕی عاس، فەتحی فەڵەستین و میصری

کرد. شاری قودسیش کە هەر لە سەردەمی حەزرەتی سولەیمانەوە جێگایەکی پیرۆز بوو، لە فەلەستین بوو. پێغەمبەری خۆشەویستیش لە شەوی میعراجدا چووبووە مزگەوتی ئەقسا لە قودس. عەمری کوڕی عاسیش (ڕەزای خوای لێبێت) پێش قودس، هەستا بە فەتح کردنی شارەکانی چواردەوری، ئینجا بەدوایدا گەمارۆی قودسیشی دا.

هێزی مەسیحیی فەرمانڕەوای قودس زۆر بەرگەیان نەگرت و خۆیان دا بە دەستەوە و پێشنیازی ئاشتییان کرد. بەڵام داوایان کرد حەزرەتی عومەر واژۆی ڕێکەوتنی ئاشتی بکات و وتیان کە کلیلی قودس تەنها دەدەنە دەستی فەرمانڕەوای دەوڵەتی موسوڵمانان. پاش پێداگریان لەسەر ئەم داواکاریە، موسوڵمانان ناچار بوون هەواڵ بۆ حەزرەتی عومەر بنێرن.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) پاش دیدار و ڕاگۆڕینەوە لەگەڵ هاوەڵە پێشەنگەکاندا، حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لە جێگەی خۆی دانا و لەگەڵ خزمەتکارەکەی بەرەو قودس کەوتنە ڕێ.

بەڵام بەهەردوکیانەوە تەنها وشترێکیان پێبوو، کە ئەویش هی حەزرەتی عومەر بوو.

ئەوەبوو هەردووکیان بە نۆرە دەچوونە سەر پشتی حوشترەکە. لە دوای چەندین ڕۆژ لە سەفەر و لەکۆتاییدا لە قودس نزیك بوونەوە، ئیتر نۆرەی خزمەتکارەکە بوو لە سەر پشتی وشترەکە بێت. بەڵام خزمەتکارەکەی ئەمەی بەلاوە جوان نەبوو ئەم لەسەر وشترەکە بێت

و ئەمیری باوەڕدارانیش بە پێ بڕوات، بۆیە بە حەزرەتی عومەری وت :

- ئەی ئەمیری ئیمانداران، فەرموو ئێوە سەرکەونە سەر پشتی وشترەکە.

حەزرەتی عومەر بە پێداگریەوە فەرمووی:

- نەخێر، نۆرەی تۆیە سەرکەویت.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) چۆکی بە وشترەکە دادا، بەڵام خزمەتکارەکە پێداگریکرد و وتی:

- من خزمەتکارێکم، بەڵام ئێوە فەرماندەی دەوڵەتێکی مەزنن، نابێت خەڵکی قودس بەم حاڵەوە بتانبینن.

- نابێت هەر تەنها لەبەر ئەوەی جێنشینم، نۆرەکەی تۆ بگرم.

دواتر خزمەتکارەکە لەسەر پشتی وشترەکە و حەزرەتی عومەریش بە پیادە درێژەیان بە ڕێگەکەیان دا.

سەرەنجام خزمەتکارەکە لەسەر پشتی وشترەکە و حەزرەتی عومەریش بە پیادە چوونە ناو شارەکە.

کە لە قودس نزیك بوونەوە، ئەبوعوبەیدە و فەرماندەکانی دیکە چوون بۆ پێشوازی کردنی. کاتێك حەزرەتی عومەریان بە جل و بەرگێکی سادە و خاکییەوە بینی، سەرسام بوون. ترسان جل و بەرگێکی ئاوا، لەرزە بخاتە متمانەی خەڵکی قودسەوە. بۆیە داوایان لێکرد جلێکی باشترە بپۆشێت بەڵام حەزرەتی عومەر داواکەیانی ڕەت کردەوە و وەڵامێکی پەند ئامێزی دانەوە:

- ئەو ناو و ناوبانگەی خوا بە ئێمەی بەخشیوە تایبەتە بە دینەکەمان. بۆ کەسی خۆشمان سادەیی بەسە.

پاشان بە پێی ئەو ڕێککەوتنەی کە واژۆ دەکرا، گیان و ماڵ و سامانی خەڵکی شارەکە دەپارێزرا. هەروەها لە بەجێگەیاندنی ئایین و بڕوای خۆیاندا سەربەست دەبوون و درێژەیان بە کارەکانیان دەدا. بەڵام دەبوایە باجیان بە دەوڵەت بدابایە.

خەڵکی قودس زۆر پەرۆش بوون بۆ بینینی حەزرەتی عومەر. کاتێك بە جل و بەرگێکی سادەشەوە دەرکەوت، بۆیان ڕوون بووەوە کە چەندە مرۆڤێکی خاکییە و هەموان پێی سەرسام بوون. بینینی سەرۆکی دەوڵەتێکی مەزن و ئەمیری باوەڕداران بە خاکێتییەکی لەم جۆرەوە و هەڵسوکەوت کردنی وەکو تاکێکی ئاسایی ناو خەڵك، بووە هۆی نەرم بوونی دڵیان لە بەرامبەر ئیسلامدا. ئەوە بوو بە هاتنی حەزرەتی عومەر کلیلی قودس تەسلیمی موسوڵمانان کرا و قودسی پیرۆزیش بە ئازادی شاد بووەوە.





# ئەو منداڵانەی لەبرسا دەگریان

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) شەو و ڕۆژ کاری دەکرد بۆ ڕەواندنەوە و چارەسەرکردنی کێشەی خەڵکی. لە یەکێك لەو شەوانەدا کە زۆر سەرقاڵ و هیلاك بوو، لەگەڵ هاوەڵەکەیدا بە شەقامەکانی شاردا دەگەڕان. بینیان وا لە دوور ئاگرێك دەگرێت.

حەزرەتی عومەر لە هاوەڵەکەی پرسی:

- دەبێت کێ ئەو ئاگرەی کردبێتەوە؟

- نازانم قوربان.

- ڕەنگە ئەو ڕێبوارانە بن کە لەبەر سەرما نەیانتوانیوە درێژە بە ڕێگەکەیان بدەن.

- منیش وەك جەنابتان بیر دەکەمەوە.

- دەڵێی چی، بڕۆین بزانین چییە؟

- کارێکی باش دەبێت.

پاشان بەرەو سەرچاوەی ئاگرەکە بەڕێکەوتن. شوێنی ئاگرەکە تا بڵێی دوور بوو. بەدەم قسەوە ڕێگەکەیان بڕی و لە ئاگرەکە نزیك بوونەوە. ئەو دیمەنەی بەرچاویان کەوت، هەردووکیانی سەرسام کرد. بینییان وا ئافرەتێکی بەتەمەن و چەند منداڵێکی چاو بەفرمێسك بە دەوری ئاگرەکەدا گرمۆڵە بوون. حەزرەتی عومەر لە ئافرەتە بەتەمەنەکەی پرسی:

- ڕێگە دەدەی بێمە پێشەوە؟

ئافرەتە بەتەمەنەکە وتی:

- ئەگەر بە نیەتی چاکەوە دێیت، بەخێربێیت. ئەگەرنا بڕۆ ونبە.

حەزرەتی عومەرپێی وت کە بە نیەتی چاکەوە هاتووە، پاشان لێیان نزیك بووەوە.

- ئەمە چ حاڵێکە ئێوەی تێدان؟

ئافرەتەکە پاش ئاهێکی قووڵ دەستی بە قسە کرد:

- لەبەر ئەوەی ماڵمان نیە، کەوتووینەتە ئەم دەشتە. دەمەوێت بەم ئاگرەی لێرە کردوومەتەوە، منداڵەکان گەرم بکەمەوە.

حەزرەت عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئاماژەی بۆ گریانی منداڵەکان کرد و پرسی:

- ئەی منداڵەکان بۆچی دەگرین؟

ئافرەتەکە لەدوای تێکدانی ئاوی ناو مەنجەڵەکە وتی:

- لە برساندا.

خەلیفە لە مەنجەڵەکە نزیك بووەوە و تەماشایەکی ناوی کرد:

- ئەی لەناو مەنجەڵەکەدا چی تێدایە؟

- ئاوی تێدایە، خۆم وا پیشان دەدەم کە چێشت لێدەنێم، چاوەڕێ دەکەم تا منداڵەکان خەویان لێدەکەوێت. ئینجا پشتی ڕاست کردەوە و هەستایە سەر پێ. پاش ئەوەی پارچە دارێکی خستە بن مەنجەڵەکە، دەردەدڵی خۆی بۆ کرد:

- لە ماڵی دنیا نە ئارد شك دەبەین، نە خوێ... عومەری خەلیفە هیچ ئاگای لە ئێمە نییە. خوا لەسەر ئەمە لێی دەپرسێتەوە.

ئینجا لە شوێنی خۆی دانیشتەوە.

ئەم قسانەی ئافرەتەکە ناخی حەزرەتی عومەری هەژاند:

- خوا بتان بوورێت، ئاخر عومەر لەکوێوە ئاگاداری حاڵی ئێوە بێت؟

- ئەی چۆن بەخۆی دەڵێت سەرکردەی موسوڵمانان و ئاگای لە حاڵی ئێمەش نییە؟

حەزرەتی عومەر ئاماژەی بۆ هاوەڵەکەی کرد تا بڕۆن. هەر کە ئەوێیان بەجێهێشت، یەکسەر بەرەو گەنجینەی خواردەمەنی بەڕێکەوتن. حەزرەتی عومەر لە فەردە ئاردەکان نزیک بووەوە و فەرمووی:

- ئەم فەردەیە بدە بە کۆڵما و تۆش سەتڵە ڕۆنێك هەڵگرە.

هاوەڵەکەی وتی:

- قوربان، گەر مۆڵەتم بدەی من فەردەکە هەڵدەگرم.

- نەخێر، بیدە بە کۆڵمدا.

کە هاوەڵەکەی بۆ هەڵگرتنی فەردەکە پێداگری کرد، حەزرەتی عومەر توڕە بوو و فەرمووی:

- ئایا تۆ دەتوانیت لە قیامەتدا تاوانەکانی من هەڵگری؟

هاوەڵەکەی لە بەرامبەر ئەم وتەیەدا نەیتوانی هیچ بڵێت. حەزرەتی عومەر فەردەکەی دا بە پشتیدا و لەگەڵ هاوەڵەکەیدا بە هەنگاوگەلێکی خێراوە گەڕانەوە بۆ لای پیرەژنەکە و ئازوقەکانیان پێدا.

ئافرەتەکە بە ئەو ئارد و ڕۆنەی کە بۆی هێنرابوو خواردنی ئامادەکرد. پاشان لە لایەکەوە منداڵەکانی تێر دەکرد، لە لایەکی تریشەوە دوعای خێری بۆ دەکردن. بە ستایشکردنەوە وتی:

- خوا پاداشتی چاکەکەت بداتەوە. تۆ لە عومەر زیاتر شایستەی مەقامی جێنشینیت.

حەزرەتی عومەر بەم وتانە دڵی ئارام بووەوە. سەیرێکی منداڵەکانی کرد و ئینجا سەیرێکی ئافرەتەکەی کرد و وتی:

- سبەینێ بچۆ بۆ لای خەلیفە و باسی بارودۆخی خۆتانی بۆ بکە. بەڵکو موچەیەکتان بۆ ببڕێتەوە، ئەم منداڵانەش لە برسێتی ڕزگاریان دەبێت.

منداڵەکان بە سکی تێرەوە هەندێك یاریان کرد و پاشان خەویان لێکەوت.

حەزرەتی عومەر بە بینینی ئەم بارودۆخە زۆر دڵخۆش بوو، بە دڵێکی ئاسوودەوە ئەو ناوەی بەجێهێشت.

بۆ ڕۆژی دواتر، ئافرەتەکە بێ کات بەفیرۆ دان چووە بەردەم دەرگای خەلیفە. کە چووە ژوورەوە یەکسەر واقی وڕما. خۆ ئەمە هەمان ئەو پیاوەیە کە دوێنێ شەو فەردە ئاردی دابوو بە کۆڵیدا و بۆی هێنابوون. بۆیە لێی پرسی:

- تۆ ئەو پیاوە بەخشندەیە نیت کە دوێنێ شەو هاتیت بۆ ماڵی ئێمە؟ بۆچی خۆتت نەناساند؟

حەزرەتی عومەر بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

- گرنگ ناسینی عومەر نییە، بەڵکو بەجێگەیاندنی پێویستییەکانی ئێوەیە.

ئەوەبوو گوێی بۆ هەموو دەرد و مەینەتییەکانی ئافرەتەکە گرت.

پاشان موچەیەکی بۆ بڕیەوە و کۆتایی بە کێشەکانی هێنا. ئەمجارەیان ئافرەتەکە هەم سەرسام، هەم دڵشاد بوو. بەدەم دوعاکردنەوە بۆ خەلیفە، ئەوێی جێهێشت و گەڕایەوە بۆ لای منداڵەکانی.

* * *

# دەبێت کێ سزا بدرێت؟

کات نیوەشەو بوو. لەبەر درەنگیی کاتەکە کەس لەو ناوەدا نەدەبینرا. حەزرەتی عومەر و عەبدوررەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خوایان لێبێت) پێکەوە هاتبوونە دەرەوە و بەناو کۆڵانەکانی شاردا دەگەڕان. لە خانوویەکی یەك قاتی بچووکەوە دەنگێکیان بیست. حەزرەتی عومەر لە عەبدوررەحمانی پرسی:

- دەزانی ئەمە ماڵی کێیە عەبدوررەحمان؟

- نازانم.

- ئەمە ماڵی ڕەبیعەی کوری ئومەییەیە. لەژوورەوە سەرخۆشن. خواردویانەتەوە و هاوار دەکەن و دەقیژێنن. دەڵێی چی، بچینە ژوورەوە و تەماشایەك بکەین؟ کێ دەزانێت بەم نیوە شەوە لە چ حاڵێکدان. بڕۆین بێ ئەوەی دەر و دراوسێیان هەراسان بکەین، بیانگرین و سزایان بدەین.

عەبدوورەحمانی کوڕی عەوف بەسەرسامییەوە سەیری حەزرەتی عومەری کرد و بەدەنگێکی پڕ گومانەوە فەرمووی:

- ئەگەر وا بکەین، ئەوا ئێمە سزای ئەوان نادەین، بەڵکو ئەوان سزای ئێمە دەدەن.

حەزرەتی عومەر بە حەپەساوییەوە فەرمووی:

- ئەوە تۆ دەڵێی چی؟!

عەبدوورەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خوای لێبێت) بۆی ڕوونکردەوە:

- خوای گەورە دەفەرموێت: "بەدوای عەیب و عار و کەموکورتیە شاراوەکانی خەڵکیدا مەگەڕێن." ئێمەش بەم نیوەشەوە، گەر سەرقاڵی گەڕان بین بەدوای عەیب و عاری خەڵکیدا و بەتەمابین ئاشکرایان بکەین. ئەو کاتە لە ڕاستیدا کارەکەی ئێمە مایەی سزادان دەبێت.

لە پای ئەمە حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- ڕاست دەکەیت، من هیچ بەم شێوەیە بیرم لێ نەکردبووەوە. هەرچی زووە با لێرە دوورکەوینەوە.

لە کاتێکدا بە خێرایی ئەو ناوەیان بەجێدەهێشت، حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لە بەر خۆیەوە بە ئەسپایی دەیفەرموو: "خوا مرۆڤ لەو دۆستانەی بێبەش نەکات کە دروست بیر دەکەنەوە. وە کەسیش لەسەر بیروڕای خۆی دەمارگیر نەکات."

* * *



# کاروان

ئافرەتێک لەناو کاروانەکەدا تەواو لە ڕێکردن ماندوو ببوو، بۆیە وتی: "ئەوە چەند ڕۆژە بەڕێوەین، بەڕاستی ماندوو بووم" مێردەکەشی بێزار بوو، چاوەڕوان بوو کاروانەکە چی زووترە مۆڵ بدات. بەڵام بۆ هێور کردنەوەی هاوسەرەکەی وتی:

- کەمێکی تر ئارام بگرە.

ئافرەتەکە دوو منداڵەکەی پیشاندا و بە ڕووی مێردەکەیدا هەڵشاخی:

- نابینیت بووە بە ئێوارە. وا کەش و هەواش هێواش هێواش سارد دەکات. سەرەڕای ئەمانەش منداڵەکان برسین و کاروانەکەش ماندووە، بە سەرقافڵە بڵێ با لە جێگەیەکی گونجاو بوەستین .

بۆیە مێردەی داماو وتی:

- با قسەی تۆ بێت.

ئینجا بە ڕاکردن ڕۆیشت بەرەو سەرەتای کاروانەکە. چووە لای سەرقافڵەکە و بارودۆخەکەی تێگەیاند. سەرقافڵەکە کەسێکی بەتەمەن بوو و لە بارودۆخەکە تێدەگەیشت، بۆیە وتی:

- باشە، لە جێگەیەکی گونجاو مۆڵ دەدەین.

مێردی ئافرەتەکە بە دڵشادیەوە گەڕایەوە و وتی:

- تەواو خانم. کە جێگەیەکی باشیان دۆزیەوە، مۆڵ دەدەین.

دڵخۆشی ئافرەتەکە لە چاوانیدا دەخوێنرایەوە. خێرا گەڕایەوە بۆ لای منداڵەکانی.

کاروانەکە گەیشتە گۆڕەپانێکی تەخت و بەتاڵ. ئەم شوێنە لە دەوروبەری مەدینە بوو.

پیری سەرقافڵەکە دەستی بەرزکردەوە و وڵاخەکانی وەستاند. بە جۆرێك کە هەموان گوێیان لێی بێت قسەی کرد و وتی:

- ئا لێرەدا مۆڵ دەدەین. ئەمشەو باش پشوو بدەن. بەیانی زوو

دەکەوینە ڕێ.

ئەوەندەی نەبرد دەست کرا بە ئامادەکارییەکانی مانەوە.

ئافرەتەکان چێشتیان ئامادە کرد و پیاوانیش چادرەکانیان هەڵدا. دواتریش بۆ پرس و ڕاکردن بۆ سەفەری ڕۆژی دواتر لە چادرێکدا کۆبوونەوە. یەکێکیان وتی:

- هەموومان زۆر ماندووین. سەرەڕای ئەوەش نازانین ئێرە کوێیە. ئەی ئەگەر شتێکمان لێ بەسەرهات؟

سەرقافڵەش لە بیرکردنەوەیەکی قوڵدا بوو. پاش ئەوەی گوێی لە هەموویان گرت، وتی:

- هیچ خەمتان نەبێت، من ئەم ناوە شارەزام. ئەو شارەی کە ڕووناکیەکانی لێرەوە دیارە خەڵکەکەی موسوڵمانن. هەرگیز لەوانەوە زیانمان پێناگات.

کەسێکی دیکەش وتی:

- منیش بیستوومە، دەڵێن موسوڵمانەکان کەسانی متمانەپێکراون. بەڵام ئێمە مەسیحین، دەترسم لەبەر ئەوەی لەسەر ئایینەکەی ئەوان نین، خراپەمان بەرامبەر بکەن.

سەرقافڵەکە دوای ئەوەی گوێی لە قسەی هەموان گرت، وتی:

- ڕاستە. پێشینان لەخۆڕا نەیانوتووە ماڵی خۆت بگرە و سەگی کەسیش بە دز مەزانە. مادام وایە دەبێت ئێمەش بە درێژایی شەو ئێشکگر دابنێین.

پاش پرس و ڕا، شەش گەنج هەڵبژێردران. ئینجا گەنجەکان ڕۆیشتن بەرەو شوێنی ئێشکگرتنەکەیان. خەڵکەکەی تریش نوستن.

پاش یەك دوو کاتژمێر گەنجە ئێشکگرەکان وردە وردە خەو زۆری بۆ هێنان. ئەمە لەبەر ئەوەی ئەمانیش وەك کاروانچییەکانی تر چەندین ڕۆژ بوو بە ڕێگەوە بوون.

کە ئێشکگرەکانیش خەوتن، کەس نەمایەوە ئاگای لە کاروانەکە بێت. ڕێك لەم کاتەدا پیاوێك هات بۆ لای کاروانەکە. بەدەوری کاروانەکەدا سوڕایەوە تا بزانێت ئێشکگریان داناوە یان نا. نەدەکرا ئەم پیاوە بەپەرۆشەش جگە لە حەزرەتی عومەر کەسێکی تر بێت.

بە ئومێدی دۆزینەوەی کەسیکی بێدار، جارێکی دیکەش بەدەوری کاروانەکەدا سووڕایەوە. بەڵام هەموویان نوستبوون، بە ئێشکگرەکانیشیانەوە. ئەو شوێنەی کاروانەکە مۆڵی تیا دابوو، شوێنێك بوو زۆر خەڵکی جۆراوجۆری لێوە تێپەڕ دەبوو. لەبەر ئەوە ئەگەری دزینی کەلوپەلە بەنرخەکانیان لە ئارادا هەبوو.

ڕاستەوخۆ بەرەو لای عەبدوررەحمانی کوری عەوف چوو و لە دەرگای دا. تەقەی دەرگا بەو نیوەشەوە، خورپەی خستە دڵی عەبدوررەحمانی کوڕی عەوفەوە. بۆیە لە شوێنی خۆی دەرپەڕی و چوو دەرگاکەی کردەوە. کە حەزرەتی عومەری لەبەر دەرگا بینی سەرسام بوو و پرسی:

- خێرە، ئەی پێشەوای ئیمانداران؟

- خێر دەبێت، خێر. تۆ خۆت ئامادەکە، دەڕۆین.

- بۆ کوێ؟

- کاروانێك هاتووه و له کەنار شار مۆڵیان داوه، ئێشکگریان نییه. دەچین پارێزگارییان لێ دەکەین.

- لەکوێوه هاتوون و بۆ کوێ دەچن؟

- نازانم ،هەموویان نوستوون.

- باشه، قوربان. هەر ئێستا دێم.

عەبدوررەحمانی کوری عەوف خۆی ئامادە کرد و هاتە دەرەوە. هەردووك پێکەوه بە هەنگاوی خێرا بەرەو ئەو شوێنه ڕۆیشتن که کاروانەکەی لێبوو. له بەرزاییەك دانیشتن و دەستیان کرد به پاسەوانی.

خەو له چاوی هەردوکیان تۆرابوو. له بەرزاییەکەوه درێژەیان دا به پاسەوانیکردنی کاروانەکە، ئێشکگیرەکانیش هێشتا هەر نووستبوون. دوای ماوەیەك یەکێك له گەنجەکان کەمێک چاوی کردەوه. حەزرەتی عومەر و عەبدوررەحمانی کوری عەوفی بینی. تێنەدەگەشت ئایا ئەوەی دەیبینێت خەوه یا ڕاستی.

ئەوەندە ماندوو بوو که دیسان چاوەکانی لێك نایەوه. بەڵام پاش ماوەیەکی کەم له پەرۆشیدا دیسان خەبەری بووەوه. سەرەتا وای بیر کردەوه کەوا ڕەنگە ئەم پیاوانه دز بن. ڕووی تێکردن و تاوێکی باش تێی ڕوانین، ئینجا له خەیاڵی خۆیدا وتی: "نەخێر، ئەمانە له دز ناچن. ئەگەر نیەتیان خراپ بووایه، ماڵ و سامانەکەمانیان دەدزی و هەڵدەهاتن. وا دیاره سەرقافڵەکە چەند پاسەوانێکی بە پاره

گرتووه.“

بەرەبەیان نزیك بووەوە و حەزرەتی عومەر و حەزرەتی عەبدوررەحمانی کوری عەوف بیریان کردەوە کە ئیتر ئەرکی ئەوان کۆتایی پێهاتووە، بۆیە بۆ بەجێگەیاندنی نوێژی بەیانی، رێی شاریان گرتە بەر.

سەر لەبەیان یەکێك لە ئێشکگرەکان چوو بۆ لای سەرقافڵەکە و ئەوەی کە شەو بینیبووی بۆی گێرایەوە، پاشان وتی:

- شەو تۆ ئەو دوو پاسەوانەت بەکرێ گرتبوو تا پاسەوانیمان بکەن؟

سەرقافڵەکە پاش ئەوەی بە سەرسامی برۆکانی بەرز کردەوە و لە گەنجەی روانی، وتی:

- ئەوە تۆ باسی کێ ئەکەی، پاسەوانی چی و شتی چی؟

گەنجەکە بە پەلە وتی:

- ئەو دوو غەریبەیەی شەو ئێشکیان بەسەرمانەوە گرت.

سەرۆکی کاروانەکە دەستێکی بەریشیدا هێنا و وتی:

- نەخێر، من جگە لە ئێوە کەسم رانەسپاردبوو بۆ پاسەوانی.

سەرۆکی کاروانەکە لە ناخەوە خەم و ترسێکی سەیر دایگرتبوو. ئەم هەواڵە یەکسەر بەناو کاروانچییاندا بڵاوبووەوە، هەمووان لە ترس و دڵەراوکێدا رایانکرد شمەکەکانی خۆیان بپشکنن. بەڵام بۆیان دەرکەوت کە هیچی لێنەبراوە.

سەرقافڵەکە وتی:

- کەوابێ ئەم پیاوانە دز نەبوون، هەبێ و نەبێ بۆ پاراستنی کاروانەکە هاتوون.

ئەم پیاوانە کێ بوون؟ بۆچی پاسەوانیی کاروانەکەیان کردووە؟ هەموو کاروانچییەکان لە خەیاڵی ئەمانەدا بوون.

سەرقافڵەکە لە گەنجەکەی کە شەو خەبەری بووبووەوە پرسی:

- گەر دیسان بیان بینیتەوە، دەیانناسیتەوە؟

- بەڵی، دەیانناسمەوە.

سەرقافڵەکە چووە سەر بەرزاییەك و سەیرێکی شارەکەی کرد. دواتر بە گەنجەکەی وت:

- ناکرێت زۆر دوورکەوتبنەوە. هەر ئێستا برۆ و ئەو پیاوانەم بۆ بدۆزەرەوە. بزانە کێن و بۆچی پاسەوانیی کاروانەکەیان کردووە.

گەنجەکە بە هەنگاوی خێرا ڕێگەی شاری گرتە بەر. کە گەیشتە ناو شار حەزرەتی عومەر و حەزرەتی عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوفی دۆزییەوە و بەنهێنی دەستی کرد بە چاودێری کردنیان. پاش کەمێک کەسێکی بینی و یەکسەر لێی پرسی:

- ئەوانە کێن؟

- یەکێکیان حەزرەتی عومەرە ئەوی تریشیان عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوفی هاوەڵی نزیکیەتی.

گەنجەکە باوەڕی بە گوێی خۆی نەدەکرد. لە دڵی خۆیدا وتی: "هەبێ و نەبێ ئەم کابرایە گاڵتەم لەگەڵ دەکات. سەرۆکی

دەوڵەتێکی گەورە و گران کەی هی ئەوەیە پاسەوانیی بکات.“

بۆیە لە چەند کەسێکی تری پرسی. بەڵام چ عەجەب، هەموان هەمان وەڵامیان دەدایەوە.

گەنجەکە چاری نەما و، بڕوای بە وەڵامەکان کرد. هەر بۆیەش بە ڕاکردن بەرەو کاروانەکە گەڕایەوە. سەرقافڵەکە هەر کە گەنجەکەی بینی، یەکسەر لێی پرسی:

- کێ بوو؟ بۆت دەرکەوت؟

- بەڵێ، دۆزیمەوە. بەڵام گەر بڵێم کێ بووە بڕوام پێناکەن.

هەمووان بە پەرۆشەوە چاوەڕوان بوون، گەنجەکە وتی:

- ئەوانەی پاسەوانییان کردین پێشەوا عومەر و هاوەڵێکی بوون.

پیاوە پیرەکە پێشتر ناوی حەزرەتی عومەری بیستبوو، بۆ دڵنیابوون سەرلەنوێ پرسیەوە:

- تۆ وتت عومەر؟

- بەڵێ، خودی سەرۆکی گەورەی دەوڵەتی ئیسلام خۆی بوو.

سەرۆکی کاروانەکە، کەسێکی ڕیش سپی و دنیا دیدە بوو، بە کاروانچییەکانی وت:

- هاوڕێیان، ئەم هەڵوێستە جوانەی عومەر، لە دینەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە. من دەچم دەیدۆزمەوە و دەچمە سەر ئایینی ئەو.

پاشان بە مەبەستی دۆزینەوەی حەزرەتی عومەر کەوتە ڕێ.

کاروانچییەکانیش نەیانتوانی لەژێر کاریگەری ئەو ڕەفتارە بەرزە دەربچن و پاش کەمێک شوێن سەرقافڵەکەیان کەوتن و هەموو بەجارێک وتیان

- ئێمەش دەمانەوێت موسوڵمان ببین.

هەموو پێکەوە حەزرەتی عومەریان دۆزیەوە. بە دوور و درێژی قسەیان لەگەڵدا کرد. لە کۆتاییشدا شایەتمانیان هێنا و موسوڵمان بوون.

* * *



# خانووە بچووکەکە

باڵوێزی ڕۆم، بۆ دیدارێکی سیاسی هاتبوو بۆ مەدینە. کە هاتە ناو شار، یەکسەر پرسیاری شوێنی کۆشکەکەی حەزرەتی عومەری کرد.

یەکێك وەڵامی دایەوە و پێی وت:

- پێشەوای موسوڵمانان کۆشکی نیە. بەڵکو دەروونێکی درەوشاوەی کۆشك ئاسای هەیە. لەماڵی دنیاش تەنها خانوویەکی بچووکی هەژارانەی هەیە و هیچی تر.

باڵوێزەکەی ڕۆم بڕوای بەمە نەکرد. چۆن دەبێت سەرکردەیەک کە سەرپەرشتی ئەم هەموو خاکە دەکات، کۆشکێکی نەبێت.

بار و دیاری و شمەکەکانی لە کەنارێك دانا و دەستی کرد بە گەڕان بە دوای حەزرەتی عومەردا.

پاش ماوەیەك هەر بە پرسیار لە خانووەکەی حەزرەتی عومەر نزیك بووەوە. دواهەمین ئافرەت کە پرسیاری لێکرد، بە دەست ئاماژەی بۆ کرد و وتی:

- ئەوەتا ئەو سەرکردەیەی تۆ بەشوێنیدا دەگەڕێیت لە ژێر ئەو دارخورمایەدا دانیشتووە.

باڵوێزی ڕۆم سەرسام ببوو. سەرکردەیەکی ئاوا گەورە و گران وا پاڵی بە دارخورمایەکەوە داوە. سەرەڕای ئەوەش یەك سەربازی لێنەبوو بۆ پارێزگاری کردنی.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەرکی بەوە کرد کە باڵوێزەکە بەرەو لای ئەو دێت. بۆیە هەستایە سەرپێ و دوای پێشوازی، فەرمووی لێ کرد دابنیشێت.

باڵوێزی ڕۆمیش بانگهێشتەکەی حەزرەتی عومەری قبووڵ کرد و لە سێبەری دارخورماکەدا دانیشتن. بە دوور ودرێژی قسەیان کرد.

ئەوەبوو بارودۆخ و هەڵسوکەوت و قسەکردنی حەزرەتی عومەر کاریگەرییەکی زۆری لەسەر باڵوێزەکەی ڕۆم دانا.

* * *



# خوای گەورە دەمانبینێت

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) شەوان بە کۆڵانەکانی مەدینەدا دەگەڕا، گەر کەسێك هەبووایە پێویستی بە یارمەتی بێت، هەوڵی دەدا یارمەتی بدات. بەدەم ڕێگەوە هەر ئەم ئایەتەی دەوتەوە: ”لە هەرکوێ بن، هەردەم خوای گەورەتان لەگەڵدایە.“

دیسانەوە شەوێك بەم هەست و خەیاڵانەوە بە كۆڵانەكانی مەدینەدا دەگەڕا. بەڵام گوێی لە دەنگی ئافرەتێك بوو. ئافرەتەكە بە كچەكەی دەوت:

- كچم لەبیرت نەچێ، ئاو بكەیتە ناو شیرەكەوە.

حەزرەتی عومەر بەپەرۆشەوە بوو كە داخۆ كچەكە چی وەڵامێكی دایكی دەداتەوە. كیژەش بەم شێوەیە وەڵامی دایكی دایەوە:

- دایە گیان، مەگەر حەزرەتی عومەر فەرمانی نەدابوو ئاو نەكرێتە ناو شیرەوە؟

- خۆ ئەو لێرە نیە، لە كوێ دەزانێت تۆ ئاوت كردۆتە ناو شیرەكە كچەكەم.

- ڕاستەكەیت دایە گیان، حەزرەتی عومەر خۆی لێرە نیە نامانبینێت، بەڵام خۆ خوای گەورە دەمانبینێت و ئاگاداری كارەكانمانە.

ئەم قسانە زۆر كاری كردە سەر حەزرەتی عومەر. كە ئەوێشی بەجێهێشت هەر ئەم ئایەتەی دووبارە دەكردەوە كە دەیفەرموو: "لە هەركوێ بن، هەردەم خوای گەورەتان لەگەڵدایە."

هەر ئەوەندەی نوێژی بەیانی كرد، یەكسەر بە مەبەستی دۆزینەوەی خاوەنی ئەو دەنگەی شەو بیستبووی، كەوتە ڕێ. لەبەر ئەوەی شارەزای كۆڵانەكانی مەدینە بوو، دۆزینەوەی شوێنەكە كارێكی ئاسان بوو.

خاوەن ماڵەكە كە دەرگاكەی كردەوە و خەلیفە عومەری لە بەرامبەریدا بینی سەرسام بوو. پاشان پرسی:

- فەرمایشتێکتان هەبوو ئەی پێشەوای موسوڵمانان؟

حەزرەتی عومەر پرسیاری کرد ئاخۆ کچی ئافرەتەکە شووی کردووە یان نا. ئافرەتەکە وەڵامی دایەوە:

- شووی نەکردووە ئەی ئەمیری ئیمانداران.

حەزرەتی عومەریش هەر ئەم وەڵامەی دەویست. بۆیە بێ چەند و چوون یەکسەر فەرمووی:

- کەوابێت من داوای کچەکەت دەکەم بۆ عاصمی کوڕم.

ئافرەتەکە وتی:

- ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەمە شەرەفێکی مەزنە بۆ خانەوادەکەمان. ئەگەر کچەکەم ڕازی بێت، ئەوا من ڕازیم.

داواکە خرایە بەردەم کیژە و ئەویش بە خۆشحاڵییەوە قبووڵی کرد.

بەم شێوەیە ئەو کچەی وانەی ڕەوشتی فێری دایکی خۆی دەکرد، بوو بە بووکی حەزرەتی عومەر.

* * *



# ئەو پیاوەی داوای مافی خۆی دەکرد

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێبێت) پاش ئەوەی بوو بە والی بەسرە، لە وتارەکانیدا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی دەکرد و درووود و سەلامی بۆ پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەنارد. دواتریش دەستی دەکرد بە ستایش کردنی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت).

ڕۆژێکیان دابەی کوڕی میحسان هات بۆ لای ئەبو موسای ئەشعەری و لێی پرسی:

- تۆ بۆچی لە وتارەکانتدا ستایشی حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) ناکەیت؟

ئەم سکاڵایە بەلای ئەبو موسای ئەشعەریەوە خۆش نەبوو. نامەیەکی نارد بۆ حەزرەتی عومەر و تیایدا سکاڵای لە دابە کرد. حەزرەتی عومەریش لە وەڵامدا نوسیبووی: "ئەو کابرایە بنێرە بۆ لام."

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەک بەسەر نامەکەدا، ڕۆژێکیان حەزرەتی عومەر چاوی کەوت بە ڕێبوارێکی سەروقژ تەپوتۆزاوی. سەلامی لێ کرد و ڕێبوارەکەش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و و خۆی ناساند:

- من دابەی کوڕی میحسانم، لە بەسرەوە هاتووم بۆ لات.

حەزرەتی عومەر دەم وچاوی بەیەکدادا و پیاوەکەش ئەم پێشوازییەی پێشەوای موسوڵمانانی بەدڵ نەبوو. بۆیە زۆر دڵتەنگ بوو. ئیتر بڕیاری دا قسەی خۆی بکات. جا کۆتاییەکەشی چ دەبێت با ببێت:

- ئەی جێنشینی موسوڵمانان دەمەوێت لێت بپرسم بۆچی لە کاتێکدا کە من بێتاوان بووم، ماندووت کردووم و لە وڵاتی خۆمەوە تا ئێرە منت هێناوە؟ بۆچی بەم جۆرە پێشوازیت لێکردم؟ ئایا ئەمە هیچ لێپرسینەوەیەکی لای خوا نابێت؟

حەزرەتی عومەر لە پاش ئەمە پرسی:

- بۆچی والیەکەم بێزار دەکەی، هیچ مافێکی خوراوت هەیە

پێت نەدرابێت؟

داببە هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و دەستی کرد بە باسکردنی دۆخەکە و وتی:

- با بۆت باس بکەم. والیەکەی تۆ دوای سوپاس و ستایشی خوای گەورە، دروود و سەلام دەنێرێت بۆ پێغەمبەری خوا. ئینجا دواتر دەست دەکات بە ستایشکردنی تۆ. من تەنها حەزرەتی ئەبوبەکرم وەبیر خستەوە. تەنها لێم پرسی: "بۆچی باسی ئەویش ناکەی؟" تاوانەکەی من تەنها ئەمەیە. جگە لەمەی بۆم باسکردی، هیچ لێك تێنەگەیشتنێکی تر لە نێوانماندا ڕووی نەداوە.

بۆ حەزرەتی عومەر، هەر ئەمەندە بەسبوو. تێگەیشت کەوا خۆی هەڵە بووە. دەبوو سەرەتا گوێی لەم پیاوە بگرتایە، ئەوجا بڕیاری بدایە. بۆیە لەو هەڵسوکەتەی پەشیمان بووەوە و فەرمووی:

- وەڵڵاهی تۆ شتێکی گونجاوترت وتووە.

ئەم وتەیەشی بە چاوی پڕ فرمێسکەوە دەوت. دەکرێت هەموو کەس هەڵە بکات. گرنگ ئەوەیە لەسەر هەڵەکەی پێداگری نەکات.

خۆ خوای گەورە کاتێك باسی ئەو کەسانە دەکات کە لەبەرامبەریدا بەرێزەوە هەڵسوکەوت دەکەن دەفەرموێت:

"ئەوان ئەگەر هاتو تێبگەن کە ئەو شتەی دەیکەن هەڵەیە، هەرگیز لەسەر هەڵەکانیان سورنابن."

داببە پێداگری نەکرد و وتی:

- خوای گەورە لە ئەمیری ئیمانداران خۆشبێت.

حەزرەتی عومەریش بەمجۆرە کۆتایی بە قسەکانی هێنا:

- وەڵڵاهی یەك شەو و ڕۆژی ئەبوبەکر، لە عومەر و هەموو خانەوادەکەی عومەر خێردارترە.

* * *



# خوا بینەرە

ساڵی حەڤدەیەمی کۆچی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) زەیدی کوڕی سابتی بانگکردە لای خۆی و پێی فەرموو:

- بڕیارم داوە عومرەیەك بکەم. تۆش لێرە دەبیت بە وەکیلی من.

پاش ئەوەی زەیدی کوڕی سابتی لە شوێنی خۆی دانا، بەڕێ کەوت. لە ڕێگەی مەککە گەیشت بە شوانێك و سەلامی لێکرد.

شوانەکە وەڵامی سەلامەکەی دایەوە. حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لێی پرسی:

- حەزمان لە مەڕێکە، پێمان دەفرۆشیت؟

شوانەکە پاش ئەوەی سەرتاپا تەماشایەکی کردن، وتی:

- ناتوانم.

- بۆچی؟

شوانەکە لەم پرسیارە تێنەگەیشت، بەڵام وتی:

- چونکە من شوانم. خۆ خاوەنی ئەم ڕانە مەڕە نیم تا پێتان بفرۆشم.

حەزرەتی عومەر لەسەر داواکاریەکەی پێداگری کرد و فەرمووی:

- وەرە تۆ مەڕێك بە ئێمە بفرۆشە و پارەکەی بۆ خۆت هەڵگرە. بە خاوەنەکەشی بڵێ گورگ مەڕەکەتی خوارد و، دەبڕێتەوە.

- شتی وا ناکەم.

- بۆ شتی ناکەیت؟ من داوای شتێکت لێ دەکەم کە سوودی تۆی تێدایە.

- ناتوانم. لەبەر ئەوەی خوای بەرز و بڵند دەمانبینێت و گوێی لە هەموو قسەیەکمانە. من دوایی چۆن وەڵامی ئەو بدەمەوە؟

ئەم وەڵامە حەزرەتی عومەری هێنایە گریان. لە دڵی خۆیدا وتی: "ئەمە ئەو کەسەیە کە بەدوایدا وێڵم، مرۆڤێکی مەرد و سەرڕاست." ئینجا لە شوانەکەی پرسی:

- تۆ لای کێ شوانی؟ کێ خاوەنی ئەم ڕانە مەڕەیە؟

دوای ئەوەی کە شوانەکە ناوی خاوەنی ڕانە مەڕەکەی پێوت، حەزرەتی عومەر ئەوێی بەجێهێشت. شوانەش بە سەرسامی سەیرێکی ئەو کابرایەی کرد کە پێش کەمێك داوای فێڵ و تەڵەکەی لێکرد و لە دواییشدا نەیتوانی بەر بە فرمێسکەکانی بگرێت و دەستی کردە گریان.

حەزرەتی عومەر هەر کە گەیشتە مەککە، خاوەنی ڕانەمەڕەکەی بانگکرد و وتی:

- دەمەوێت ئەو شوانەت لێبکڕم.

- لە خزمەتتدایە ئەی ئەمیری ئیمانداران! بەڵام دەمەوێت بزانم کە بۆ دەتەوێت بیکڕی؟

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە و ئەویش شوانەکەی پێفرۆشت. پاشان هەواڵیان بۆ نارد بۆ شوانەکە. کاتێك هات و ئەو پیاوەی دوێنێی لەگەڵ خاوەنەکەیدا بینی، سەری سوڕما. خاوەنەکەی پێی وت:

- ئیتر لەمەودوا تۆ دەبیتە شوان لای حەزرەتی عومەر.

شوانەکە بڕوای بە گوێیەکانی نەدەکرد. حەزرەتی عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) پاش ئەوەی شوانەکەی لە کۆیلایەتی ڕزگار کرد، ڕانەمەڕێکیشی بەدیاری پێدا.

* * *



# ئەو ئافرەتەی حەزرەتی عومەری خستە گریان

ڕۆژێکیان حەزرەتی عومەر و موعەللای هاوڕێی (ڕەزای خوایان لێبێت) بە ڕێگادا دەڕۆیشتن. لە ناکاو گوێیان لە دەنگی

ئافرەتێك بوو کە هاواری دەکرد و دەیوت:

- عومەر بوەستە! چاوەڕێم بکە!

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) وەستا. ئاوڕیدایەوە و بە ئافرەتەکەی وت:

- فەرموو پوریێ گیان.

ئافرەتەکە دوای ئەوەی تەماشایەکی حەزرەتی عومەری کرد، وتی:

- تۆ سەردەمانێك منداڵێکی بچوك بوویت. بەڵام وا ئێستا گەورە بوویت و بوویت بە پێشەوای باوەڕداران.

حەزرەتی عومەر قسەی بە ژنەکە نەبڕی و بەردەوام بوو لەسەر گویێ لێگرتنی.

ئافرەتەکەش:

- بەڵام ئەی کوڕی خەتتاب، وریابە! دەستەڵات گومڕا و لەخۆباییت نەکات. هەروەها ئەوەشت لەبیر نەباتەوە کە دەبێت هەردەم لە بەردەم خوای گەورەدا ڕێزی خۆت بگریت.

گویێ شلکردنی حەزرەتی عومەر بۆ وتەکانی ئەم ئافرەتە، بەوێنەی منداڵێکی گوێڕایەڵ و سەردانەواندنی لە ئاستیدا، ببووە جێی سەرسامی موعەللای هاوڕێی. بۆ خۆی پێ نەگیرا و بە ئافرەتەی وت:

- پیرەژن بەسە! خەلیفەت خستە گریان.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی:

- ئارام بە، ئایا تۆ دەزانیت ئەم ئافرەتە کێیە؟

موعەللا بێدەنگ بوو. حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- ئەم ئافرەتە خەولەی کچی حەکیمە. خوای گەورە لە سەروو ئاسمانەکانەوە گوێی بۆ سکاڵای ئەم گرتووە و بەدەم داواکەیەوە هاتووە. ناکرێت ئێستا عومەر گوێی لێ نەگرێت. دڵنیابە گەر ئەم ئافرەتە تا خۆرئاوابوونیش قسە بکات، تەنها نوێژ لە گوێ لێ گرتنیم دوور دەخاتەوە.

* * *

# شایەت

پیاوێکیان بە مەبەستی شایەتیدان، هێنا بۆ لای حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت). حەزرەتی عومەریش بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لە دروستی توانای ئەم کابرایە بۆ شایەتی دان، پێی فەرموو:

- کەسێکم بۆ بێنە باش بتناسێت.

دوای ئەوەی پیاوەکە ڕۆیشت، ئەوەندەی پێ نەچوو هاتەوە و کەسێکیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. حەزرەتی عومەر بۆ ئەوەی تەواو دڵنیا بێتەوە لەو کەسەی کە پیاوەکە هێنابووی پرسی:

- ئایا ئەم پیاوە دەناسی؟

پیاوەکە زۆر لەسەرخۆ وتی:

- بەڵێ دەیناسم، کەسێکی باشە.

بێگومان ئەمەندە قسە بەس نەبوو بۆ قایل کردنی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت). بۆیە بەردەوام بوو لە پرسیارکردن:

- باشە چ جۆرە پەیوەندییەك بەم کابرایەوە دەتبەستێتەوە؟ بۆ نموونە ئێوە دراوسێن؟ دەزانیت کێ هاتوچۆیماڵیان دەکات؟

- نەخێر، دراوسێی نیم.

- سەفەرت لەگەڵیدا کردووە؟

- نەخێر، سەفەریشم لەگەڵدا نەکردووە.

- لەگەڵ ئەم پیاوەدا کاروکاسبیتان پێکەوە بووە؟

- نەخێر ئەی پێشەوای ئیمانداران.

- وا گومان دەبەم، تۆ ئەم پیاوەت تەنها لە کاتی نوێژ کردن یا قورئان خوێندندا بینیبێت، بۆیە هاتووی شایەتی بۆ دەدەیت.

- بەڵێ، پێشەوای ئیمانداران. ئێوە ڕاست دەکەن.

- کەوابێت تۆ ئەم پیاوە لە بارودۆخە ڕاستەقینەکەیدا ناناسیت. فەرموو بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە.

دواتر ئاوڕی بەلای پیاوەکەدا دایەوە و پێی وت:

- کەسێکمان پێویستە کە بەڕاستی بتناسێت.

حەزرەتی عومەر تەنانەت لە پرسێکی زۆر بچووکیشدا، هەتا

نەچوایەتە بنج و بناوانی بڕیاری نەدەدا. بۆیە پیاوەکە بۆ دۆزینەوەی کەسێك کە باش بیناسێت حەزرەتی عومەری جێهێشت و ڕۆیشتە دەرەوە.

* * *



# ئافرەتە بەساڵاچووەکە

کات درەنگانەی شەو بوو. تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵاش لە گەڕانەوەدا بوو بەرەوە ماڵەوە. کاتێک گەیشتە گەڕەکی خۆیان بینی وا پیاوێکی باڵابەرز لە ماڵێکی دراوسێیانەوە دێتە دەرەوە. ئەوەی جێی سەرنج بوو ئەوەبوو کە لەو ماڵەدا تەنها ئافرەتێکی بەساڵاچووی بێ کەسوکار دەژیا. ئەوەندە هەبوو کە ئەم زۆر

ئاگاداری بارودۆخ و گوزەرانی ئافرەتەکە نەبوو. بەڵام لە دڵی خۆیدا دەیوت تۆ بڵێی بەم شەوە درەنگە ئەو پیاوە ئیشی چی بووبێت بەو ئافرەتە بەساڵاچووە؟

پیاوەکە بێ ئەوەی ئەم ببینێت، لەو ناوە دوورکەوتەوە و لەبەر چاو دیارنەما. بەڵام حەزرەتی تەڵحە (ڕەزای خوای لێبێت) نەیدەتوانی پێش بە بیرکردنەوەکانی مێشکی بگرێت. بۆیە بەدەم ڕۆیشتنەوە دەیوت "وا باشترە من لەم مەسەلەیە تێبگەم"

هەر کە ڕۆژ بووەوە یەکسەر چوو بۆ ماڵی ئافرەتە پیرەکە و لەدەرگای دا. لە ژوورەوە دەنگێک وتی:

- وەرە ژوورەوە.

کە چووە ژوورەوە، تەماشای کرد وا ئافرەتێکی نابینای پیر دانیشتووە. بۆیە خێرا سەلامی لە ئافرەتەکە کرد و پرسی:

- باشە دایەگیان تۆ هیچ کەسێکت نیە؟

ئافرەتە پیرەکەش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

- کوڕم لە خوای گەورە زیاتر کەسم نیە.

تەڵحە بێ ئەوەی پێچ و پەنا بخاتە قسەکانییەوە وتی:

- دوێنێ شەو چاوم لێبوو کە لەم ماڵە پیاوێك چووە دەرەوە. دەتوانم بزانم ئەوە کێ بوو؟

ئافرەتەکە کەمێك وەستا و دواتر وتی:

- عومەری کوڕی خەتتاب بوو. خوا لێی ڕازیبێت دەمێکە شەوان

دێت ماڵەکەم بۆ پاك دەکاتەوە. جێگەکەم بۆ ڕادەخا و هەر کارێکی تریشم هەبێت بۆم ڕادەپەڕێنێت ئەوجا دەڕواتەوە.

حەزرەتی تەڵحە(ڕەزای خوای لێبێت) بە بیستنی ئەم قسانە نەیتوانی پێش بە فرمێسکەکانی چاوی بگرێت. بۆیە بەدەم سڕینی فرمێسکەکانییەوە، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد لەسەر ئەو پێشەوا چاکەی پێی بەخشیبوون. پاشان مۆڵەتی لە ئافرەتەکە خواست و ئەوێی بەجێهێشت.

* * *



# کە مرۆڤەکان برسین

ساڵێکیان قات و قڕیەکی بێ ئامان باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو. دەشتەکیەکانی دەوروبەری شار لەبەردەم مەترسی مردندا بوون. بۆیە ناچار هاتبوون بۆ مەدینە. بەڵام حاڵی خەڵکی مەدینەش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەواندا نەبوو.

حەزرەتی عومەر بەم بارودۆخەیان زۆر دڵتەنگ دەبوو. بۆیە جاری وا هەبوو چەندین ڕۆژ لەسەر یەک ڕۆژووی دەگرت. ئەمەش بۆ ئەوەی ئاگای لە حاڵیان بێت و لێیان تێبگات.

هەر لەم بارودۆخ و ڕۆژە سەختانەدا بوو کە ڕۆژێکیان وشترێکی سەربڕی. پاشان گۆشتەکەی بەسەر خەڵکەکەدا دابەشکرد. یەرفەی

خزمەتکاریشی پارچەیەک گۆشتی ناسکی کوڵاند و خستیە ناو قاپێك و هێنای بۆ حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت). حەزرەتی عومەریش لێی پرسی:

-ئەمە چیە؟

- ئەمە گۆشتی وشترەکەی ئەمڕۆیە. بۆ تۆشمان هێناوە.

حەزرەتی عومەر سەیرێکی گۆشتەکە و سەیرێکی خزمەتکارەکەشی کرد و پێی وت:

- وا خەریکە خەڵکەکە لە برساندا بمرێت و منیش باشترین و ناسکترین شوێنی وشترەکە بخۆم و سکم تێرکەم؟! ئەم قاپە هەڵگرە و لایبە خواردنیکی دیکە بۆمن بێنن.

ئەمجارەشیان بەهەمان شێوەی ئێوارەکانی تر، نان و ڕۆنی زەیتونیان بۆ هێنا. حەزرەتی عومەر نانەکەی کرد بەچەند لەتێکەوە و دەستی برد شتێک بخوات، بەڵام کەمێک وەستا و بێ ئەوەی یەك پاروو چیە لە نانەکە بخوات دەستی گێڕایە دواوە. پاشان بانگی یەرفەی کرد و پێ فەرموو:

- یەرفە

- فەرموو ئەی ئەمیری ئیمانداران.

- ئەم نان و خوانە بەرە بۆ ئەو دەشتەکیانەی لە گەڕەکەکەی تەنیشتمانەوە دادەنیشن. ئەوە سێ ڕۆژە نەمتوانیوە بچم بۆ لایان. لەوە دەچێت ئێستا برسی بن و نان نەبێت بیخۆن.

یەرفە قاپەکەی هەڵگرت و چوو خواردنەکەی پێشەوای

موسوڵمانان ببەخشێت. ئەوەبوو حەزرەتی عومەر دیسان بێ ئەوەی دەم بۆ پارووە نانێک بەرێت، نییەتی ڕۆژووی ڕۆژی پاشتری هێنا.

* * *



# کراسێک لە دوو پارچەقوماش

- بیگرە کوڕم ئەم قوماشە بەشی بەری من ناکات. هیچ نەبێت تۆ کراسێکی لێ بدوورە بۆخۆت.

حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێبێت)، دەیویست ئەو پارچە قوماشەی بەر خۆی کەوتبوو بیداتە کوڕەکەی. بەڵام کوڕەکەی نەیویست وەری بگرێت و بە باوکی وت:

- نەخێر، باوکەگیان. ئەگەر من قوماشەکەی ئێوەش بخەمە سەر ئەوەی خۆم ئەواکراسەکەم درێژ دەردەچێت. ئەو کات بەفیڕۆ دەچێت و ئیسراف دەبێت.

- زیادەکەی دەدەی بەیەکێکی دیکە.

- لە پارچە زیادەکە کراس دەرناچێت. وەرە دڵی کوڕی خۆت مەشکێنە و منیش ئەوەی خۆم دەدەم بە تۆ. هەردوکیان پێکەوە بۆ تۆ بەش ئەکات. مەگەر خودا بۆخۆی بزانێت لە کەیەوە هەمان کراس لەبەر دەکەیت!!

- ئەی باشە خەڵک ناڵێن عومەر قوماشی زیادەی وەرگرتووە؟

- ئەگەر وایان وت ئاوا من بۆیان ڕوون دەکەمەوە.

بەم شێوەیە حەزرەتی عومەر داواکەی عبداللەی کوڕی قبووڵ کرد.

حەزرەتی عومەر هەردوو قوماشەکەی خستە سەریەک و کراسێکی لێ دووری. لە ناخەوە ئاسودە نەبوو، بەڵام چاریان نەبوو دەبووایە وایان بکردایە، چونکە قوماشەکە بەشی دوو کراسی نەدەکرد. هەروەها کراسەکەی بەریشی گەلێک کۆن ببوو.

دوای ئەوەی کراسەکە تەواو بوو، بۆ وتاردان لە بەریکرد و پێوەی چوو بۆ مزگەوت. بۆ خوێندنەوەی وتارەکەی چووە سەر

مینبەرەکەی پێغەمبەری خوا و دەستی پێکرد:

- گوێ بگرن ئەی خەڵکینە..

بەڵام سەلمانی فارسی کە لە وتارەکەدا ئامادەبوو بە دەنگێکی بەرز وتی:

- گوێ ناگرین!

حەزرەتی عومەر بە سەرسامییەوە پرسی:

- بۆچی گوێ ناگرن؟

- ئەو کراسەی لەبەرتاندایە دوو ئەوەندەی ئەو قوماشەیە کە بە ئێمەتان داوە. هەتا هۆکاری ئەمەمان بۆ باسنەکەن و بۆمان ڕوون نەکەنەوە، گوێت لێناگرین.

حەزرەتی عومەر چاوی گێڕا و پرسی:

- عبداللەی کوڕم لەکوێ یە؟

عبدالله وەڵامی دایەوە و وتی:

- لێرەم باوکەگیان.

حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- هەستە کوڕم، وەڵامی بدەرەوە.

عبدالله هەستایە سەرپێ و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە و وتی:

- باوکم لەو قوماشەی کە هەریەکێك لە ئێوە وەرتانگرتوە زیاتری وەرنەگرتوە. تەنها چونکە باڵای زۆر بەرزە و هەستم کرد کراسەکەی

کورت دەردەچێت بۆیە قوماشەکەی خۆشمم پێشکەش کرد.

حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- ئەی سەلمان ئایا ئەم ڕوونکردنەوەیە بەسە.

سەلمان ئەوەی دەویس، گوێی لێبێت، بیستی. لە ڕاستیدا ڕووی دەمی ئەو لە کراسەکەی حەزرەتی عومەر نەبوو. چونکە حەزرەتی عومەری زۆر چاک دەناسی. بەڵام بۆ ئەوەی نیشانەی پرسیار لە مێشکی خەڵکەکەدا نەمێنێتەوە دەیویست بارودۆخەکە ڕوونببێتەوە. کە مەبەستەکەی خۆی پێکا فەرمووی:

- تەواوە، ئەی ئەمیری ئیمانداران. فەرموون ئێستا قسە بکەن. ئیتر گوێت لێدەگرین.

حەزرەتی عومەر ئاسودە بووەوە و بە سەلمانی فارسی فەرموو:

- خوا لێت ڕازی بێت. پشتیوان بەخوا هەتا کەسانی وەک تۆ هەبن کە هەڵەی کەسانی سەروو خۆیان ببینن و ڕەخنەی ئاڕاستەبکەن، ئەم دینە سەرفراز و بەشکۆ دەبێت.

* * *

# تەنانەت والیش ڕزگاری نەبوو

دەمەو ئێوارە بوو. لە کۆڵانەکانی مەدینەوە دەنگی ناڵەی ئەسپ بەرزبووەوە. ئەسپ سوارەکان نێردراوی پێشەوای موسوڵمانان، حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بوون. ئەمانە فەرمان و بڕیارەکانی سەرکردەی وڵاتیان بە والییەکانی دەوڵەت لە چوار لای دنیادا دەگەیاند. نامەی ئەم جارەش بانگهێشتنامە بوو بۆ والییەکان. کە ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیە بوو:

"... والییە بەرێزەکەم، لە وەرزی حەجدا لە کەعبەی پیرۆز چاوەڕوانتین .."

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هەموو ساڵێك لە وەرزی حەجدا ئەم هەواڵەی بۆ والیەکان دەنارد و بانگهێشتی کەعبەی پیرۆزی دەکردن. والیەکانیش هەر بە گەیشتنی هەواڵەکە خۆیان ئامادە دەکرد و بەڕێدەکەوتن. ئامانجی سەرەکی سەرۆکی دەوڵەت

لەم کۆبوونەوەیە، بۆ ئەوەبوو کە پێکەوە لەگەڵ والییەکاندا گوێ بۆ دەرد و ناخۆشی و سکاڵای خەڵکەکە بگرن.

هەموو جارێکیش چەند کەسێک ڕادەسپێردران بۆ ئەوەی بەناو حاجیەکاندا بگەڕێن و پێیان ڕابگەیەنن کە وا سەرۆکی دەوڵەت چاوەڕێیە بێن گوێ لە سکاڵاکانتان بگرێت.

دیسان لە وەرزێکی تری حەجدا دوای ئەوەی هەواڵ بۆ هەموو والیەکان نێردرابوو. ئەوانیش لەکاتی خۆیدا ئامادەبوون.

جاڕ درا و خەڵکیش بەپەرۆشەوە لە مەیدانەکەدا کۆبوونەوە. ئیتر کاتێک خەڵکەکە هەموو ئامادە بوون، حەزرەتی عومەر هەستایە سەرپێ و فەرمووی:

- ئەی خەڵکینە، من فەرمانبەرەکانم دەنێرم تاوەکو لەگەڵتان چاکبن و ڕێگەی ڕاستتان پیشانبدەن. ئایا کەس هەیە لەناوتاندا سکاڵای لە والیەکەی هەبێت؟

پیاوێك لە حەزرەتی عومەر نزیك بووەوە و وتی:

- فلانە والی تۆ، بەناحەق سەد دانە قامچی لێدام.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئاوڕی بۆ والی ناوبراو دایەوە و لێی پرسی:

- ئایا ئەوە ڕاستە کە سەد قامچیت لەم پیاوە داوە؟

والیەکە وتی:

- بەڵێ وایە.

حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- هۆکارەکەیم بۆ ڕوون بکەرەوە.

کاتیك کە والیەکە نەیتوانی هۆکارێك بدات بە دەستەوە، ئاشکرا بوو کەوا پیاوەکە لەسەر حەقە. حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) قامچیەکەی دەستی بۆ پیاوەکە درێژکرد و فەرمووی:

- ئادەی حەقی خۆت وەرگرەوە.

حەزرەتی عومەر هەرگیز ئەم ڕەفتارەی بە گاڵتە نەبوو. عەمری کوڕی عاص کە دەیزانی ئەم بارودۆخە لەسەر والییەکە زۆر قورس دەشکێتەوە. لە حەزرەتی عومەر نزیکبووەوە و فەرمووی:

- ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەم مامەڵەیە زۆر قورسە، هەروەها ڕەنگە ئەمە لەدوای تۆ ببێتە نەریت.

حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- ناتوانم لەبەر والیەك جیاوازی بکەم.

دواتر ئاوڕی دایەوە بەلای پیاوەکەدا و پێی فەرموو:

- حەقی خۆت وەرگرە.

عەمر نەیدەویست ئەوە ڕوویدات، بۆیە وتی:

- باشە، چۆنە ئەگەر ئێمە بتوانین ئەم پیاوە ڕازیبکەین لە حەقی خۆی خۆش بێت؟

حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- ئەگەر دەروونی پیاوەکە ئاسودە بێت من قسەیەکم نیە.

خەڵکەکە هەمرو سەرسام ببوون لە بەرامبەر ئەو شتانەی لە پێش چاویاندا ڕوویاندەدا. چونکە ئاسایی نەبوو کەوا والیەکی گەورە و گران، لەپێش چاوی خەڵکیدا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرا. بۆیە هەمووان دەستیان بەرز کردەوە و سوپاسی خوایان کرد کە سەرکردەیەکی هێندە دادپەروەر فەرمانڕەوای دەوڵەتەکەیانە.

دوای مامەڵەیەکی دوورو درێژ توانییان پیاوەکە بە دوو سەد دینار قایل بکەن و لە حەقی خۆی خۆشببێت. پاشان لەپێش چاوی خەڵکەکە و حەزرەتی عومەردا ڕایگەیاند کەوا لە حەقی خۆی خۆشبووە. بەم جۆرە والییەکەش لە قامچی خواردن دەربازی بوو.

* * *



# کاتی پێکشادبوونەوە

که بانگی بەیانی درا، خەڵکی بۆ ئەنجامدانی نوێژ ڕوویان لە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا کرد. ئەبو لونلونیش کە کۆیلەیەکی ئێرانی بوو، ڕێگەی مزگەوتی گرتبووە بەر. گەر بە باشی سەرنجت بدایە، هەستت بە لەرزینی لاقەکانی دەکرد. ئەبو لونلوء بە باشی شارەزای هونەرەکانی وەک ئاسنگەری، نیگارکێشی و دارتاشی

بوو. به کاری ئاشەوانی ژیانی خۆیی بەڕێوە دەبرد. بەڵام ئەو باجەی کە بە گەورەکەی دەدا بەلایەوە زۆر بوو. بۆیە بەمەبەستی کەمکردنەوەی باجەکەی خۆی گەیاندە لای حەزرەتی عومەر. داوای لێکرد کە بە گەورەکەی بڵێت بۆی کەم بکاتەوە. بەڵام حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) داواکارییەکەی لوئلوئی گێڕایەوە و پێ وت کە باجاکەی زۆر نییە. ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە ئەبو لوئلوء ڕق و قینێکی ئێجگار زۆری لە حەزرەتی عومەر هەڵگرتبوو. بۆیە هەمیشە سەرقاڵی پیلان گێڕان بوو بۆ کوشتنی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت).

لە کۆتاییدا بڕیاریدا کە دەستی بە خوێنی سەرکردەی موسوڵمانان سوور بکات. بۆ ئەم مەبەستەش کاتی نوێژی بەیانی دەستنیشانکرد بۆ جێبەجێکردنی تاوانەکەی. بۆیە دەموچاوی بە باشی داپۆشی و بێ ئەوەی کەس بیناسێتەوە چوو بوو بۆ نوێژی بەیانی. لە مزگەوت لە ڕیزی یەکەم لای مینبەرەکەوە دانیشت.

حەزرەتی عومەریش وەکو هەموو جارێك بەو هەست و نەستە قورس و مەزنەی کە لە کاتی ئەنجامدانی نوێژدا هەیبوو لە مینبەرەکە نزیك بووەوە و سەرەتا سەیری لای ڕاست و پاشان لای چەپی کرد. پاشان داوای لە نوێژخوێنان کرد کە بۆشایی نێوان سەفەکان پڕبکەنەوە و شان بدەن بەشانی یەکەوە. پاشان "اللەاکبر"ی کرد و نوێژەکەی دابەست. لەو کاتەدا ئەبولوئلوء بەو دەرفەتە گەیشتبوو کە پێشتر پیلانە قێزەونەکەی بۆ داڕشتبوو.

بۆیە خێرا خەنجەرەکەی دەرهێنا و کردی بە سکی حەزرەتی

عومەردا. هەموو ئەم شتانە لە کاتێکی هێندەی چاوتروکانێکدا ڕوویاندا.

حەزرەتی عومەر بە ئازارەوە کەوتە سەر زەویەکە. بکوژ پاش هەوڵێکی زۆر کە زانی ڕزگاری نابێت، خەنجەرەکەی دەستی بەرز کردەوەو کردی بەسەر دڵی خۆیدا.

کە لوئلوء کوژرا هەموو خەڵکەکەش بەرەو لای حەزرەتی عومەر ڕایان کردەوە. حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هەر کە کەمێک هۆشی هاتەوە، یەکەم شت کە پێی هەستا خوێندنی ئەو ئایەتە بوو کە ئەمە ماناکەیەتی "فەرمانی خوای گەورە، پێشتر نوسراوە و لە بارێکدایە کە گۆڕانی بەسەردا نایەت، بێگومان ئەوەش قەدەرە"

دوای ئەوەی کە ئایەتەکەی خوێند دیسان لە هۆش خۆی چووەوە. بۆیە بردیانەوە بۆ ماڵەوە. کاتێك هۆشی هاتەوە پرسیاری کاتی نوێژی کرد. هاوەڵانیش پێیان ڕاگەیاند کەوا هێشتا خۆر هەڵنەهاتووە و کات ماوە.

بۆیە یارمەتییان دا و دەست نوێژی هەڵگرت. پاشان لە نوێژەکەیدا هەر دوو سورەتی "عەصر و کافرون"ی خوێند. هێشتا برینەکەی خوێنی لێدەهات کە بە عبداللەی کوڕی فەرموو:

- بڕۆ بزانە کێ بوو دەستی بە خوێنی من سوور بوو؟

عبدالله وتی:

- ئەبو لوئلوء

حەزرەتی عومەر هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و زۆر سوپاسی

خوای کرد کەوا کەسێکی موسوڵمان دەستی نەچۆتە خوێنی جێنشینی موسوڵمانانەوە. ئەمجارەشیان ڕووی کردە عبداللەی کوڕی و فەرمووی:

- بڕۆ بۆ لای حەزرەتی عائیشە. پێی بڵێ بزانە مۆڵەتم دەدات منیش لە تەنیشت هەردوو هاوڕێکەمەوە بنێژرێم!

کاتێك عبداللەی کوڕی هاتەوە پێی ڕاگەیاند کەوا حەزرەتی عائیشە فەرموویەتی: "هەرچەندە ئەو شوێنەی لە ژوورەکەدا ماوەتەوە بۆخۆمم دانابوو، بەڵام نەفسی عومەر پێشخۆم دەخەم" زۆر خۆشحاڵ بوو. بەڵام ئەم وەڵامە بە تەواوەتی ئاسودەی نەکردبوو بۆیە بە عبداللەی کوڕی فەرموو:

- پێش ئەوەی جەنازەکەم بەرنە ژوورەوە جارێکی تر لە حەزرەتی عائیشە بپرسنەوە، نەوەك لەبەر ڕێزگرتن بۆ پلەی جێنیشینیەکەم داواکەمی قبووڵ کردبێت. جا ئەگەر ڕەتی کردەوە ئەوا لە گۆڕستانەکەی دی بمنێژن.

حەزرەتی عومەر لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانیدا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەتا دەهات لاوازتر دەبوو. ئەوەبوو پزیشك هات پشکنینی بۆ کرد، بەڵام ڕەنگی پزیشکەکە تەواو گۆڕا و وتی:

- ئەی پێشەوای ئیمانداران، بەڕاستی هیچ شتێکمان لەدەست نایەت. کاتی وەسیەت کردنە.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بە چاوی پڕ فرمێسکەوە تەماشایەکی ئەو کەسانەی دەوروبەری خۆی کرد. بێگومان ئەم

فرمێسکانه فرمێسکی خۆشی بوون. چونکه له نزیکترین کاتدا به خۆشەویستترین کەسی ناودڵی شاد دەبووەوە.

ئەوەبوو خۆری تەمەنی حەزرەتی عومەر ئاوا بوو. دوا ڕستەش که له لێوەکانیەوە هاته دەرێ ئەمه بوو: "شاهیدی دەدەم که بێجگه له خودا کەس شایستەی پەرستن نیه، دیسانەوه شاهیدی دەدەم که محمد بەنده و نێردراوی ئەوه"

ئەو کەسەی که نمونەیەکی زیندووی دادپەروەری بوو و وه له هەموو کەس زیاتر پێغەمبەری خوای خۆش دەویست، له تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا بەرەو جیهانی نەبڕاوه کۆچی کرد.

* * *

# حەزرەتی
# عومەر
## ڕەزای خوای لێبێت

شەوێکیان حەزرەتی عومەر لەگەڵ هاوەڵێکیدا بە شەقامەکانی مەدینەدا دەگەڕان. لە دوورەوە ئاگرێکیان بەدیکرد و بەرەو ئەوێ بەڕێکەوتن. بینییان وا ئافرەتێکی بەتەمەن مەنجەڵێک ئاوی خستووەتە سەر ئاگر بۆئەوەی برسێتیی لەبیری منداڵەکانی بەرێتەوە و بیانخەوێنێت.

کاتێک حەزرەتی عومەر ئاگاداری بارودۆخی ژیانیان بووەوە، دەستبەجێ گەڕایەوە بۆ مەدینە و ئارد و ڕۆنی بۆ هێنان.

پاشان چاوەڕێی کرد تا منداڵەکان تێریان خوارد. جا کاتێک بزەی سەر لێویانی بینی زۆر دڵخۆش بوو. دواتر بە ئافرەتەکەی وت کە بۆ ڕۆژی دواتر بچێت بۆ لای خەلیفە. ئیتر بە دڵێکی ئاسوودەوە ئەو ناوەی بەجێهێشت.







نرخی ٣٠٠٠ دینارە